**یەکەم ژمارەی ڕۆڤار ٥-٥-١٩٩٩ دەرچوە**

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
ئیدریس عەلی

گرافیك دیزاین
ئارام عەلی

تیراژ: ١٢٠٠

نرخ: ١٢٥٠

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی
ئیمێڵی
edrisali16@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەممەد مەولود (مـەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارە ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هـەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەممەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەممەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەممەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەممەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شاربازێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحموی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەممەد ئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەحمەد کایا، مەولەوی،قانیع.عوسمان چێوار.کەریم کابان،ڕەفیق حیلمی، مستەفا زەڵمی.

سەرۆکی فەخری
شێرکۆ بێکەس

سەرۆکی دەزگا
ئازاد بەرزنجی

بەڕێز فاروق مەلامستەفا سپۆنسەری ئەم ژمارەییەی کردووە

هەرجارێ کە خۆمان بۆ دەرکردنی ڕۆڤارێکی نوێ ئامادە دەکەین، بیر لەوە دەکەینەوە ئەو کەسەی ڕۆڤاری لەسەر دەردەکەین کێیە و ئاستی داهێنانی لە یەکێک لە بوارەکاندا چۆنە و ڕۆڵ و کاریگەری چییە لەسەر سەردەمەکەی خۆی و پاش خۆی؟ هاوکات بیرکردنەوەمان چڕ دەکەینەوە لەسەر ئەوەی لەڕێگەی نووسین و زانیاری کەسانی تایبەتمەند و پسپۆڕ و شارەزاوە، زۆرترین زانیاری لەسەر ڕەهەندەکانی ژیان و داهێنانی ئەو کەسە بخەینە ڕوو کە تێیدا جەخت لە ڕۆڵ و کاریگەری و ئاستی داهێنانی بکەنەوە و لایەنە شاراوەکانی ئاشکرا بکەن.
نایشارینەوە لەم ژمارەیەی ڕۆڤاردا کە تایبەتە بە هونەرمەندی شێوەکاری کۆچکردوو (ئازاد شەوقی) دووچاری نیگەرانی بووین و بێئومێد بووین لە ژمارەیەک هونەرمەندی شێوەکار کە بتوانن لەسەر ژیان و تابلۆ و داهێنانی ئەم هونەرمەندە ناودارەی کورد بنووسن و هاوکارمان بن بۆ ئەوەی ڕۆڤاری (ئازاد شەوقی) دەوڵەمەند تر بێت بە زانیاری و لایەنە هونەرییەکانی ئەو هونەرمەندە.
بەڵام خۆشبەختانە لە ڕێگەی پەیوەندییەکانمانەوە، توانیمان ژمارەیەکی کەم لەو نووسەر و هونەرمەندانە بخەینە سەر کەڵکەڵەی نووسین کە شارەزاییان لە بوارەکەدا هەیە و ئازاد شەوقی و هونەرەکەی باش دەناسن.
ڕەنگە ئێمە کەمترین ڕۆڤارمان لەسەر هونەرمەندی شێوەکار دەرکردبێت، ئەمەش هۆکاری تایبەت و دیاریکراوی خۆی هەیە، بەڵام بۆ کەسێکی وەک ئازاد شەوقی کۆچکردوو، مەسەلەکە جیاوازە، پێگەی هونەری و ئاستی داهێنانی ئەو هونەرمەندە خۆی لە خۆیدا جێگای بایەخ و تێرامانە، تابلۆکانی ئەو کە بەشێوەیەکی بەرچاو خۆی لە سرووشتدا دەبینێتەوە، تەنها بۆ قۆناغێکی دیاریکراو گرنگ نین، بەڵکوو بۆ ئێستا و داهاتووش دەبنە مایەی چێژبەخشین بە چاوانمان و تێرامانی قوڵ و خوێندەوەی زانستیانە.
بەهیواین ئەم ڕۆڤارەشمان مایەی سوود و ڕەزامەندی هەموان بێت و توانیبێتمان یەکێکی تر لە داهێنەرانی کورد بە تایبەت بە نەوەی نوێ بناسێنین.

**سکرتێری نووسین**

# ژیاننامە

* (ئازاد مەحمود شەوقی) هونەرمەندی ناوداری گەلی کورد، ساڵی 1930 لە شاری هەولێر لەدایک بووە. ساڵی ١٩٥٥ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا، خولی یەکەمی تەواو کردووە، پاشان بۆ ماوەی 13 ساڵ لە شاری سلێمانی سەرپەشتیاری پەروەردەیی بووە. سەرەتای کاری هونەریی لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغداوە دەستی پێ کردووە. لە ژیانی هونەرییدا دەیان پێشانگەی نایابی کردووەتەوە کە سەرجەم تابلۆکانی گوزارشت لە جوانیی کوردستان و کۆمەڵی کوردەواری دەکەن. شەوقی لە شاری دیوانیەی باشووری عێراق خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە و لە شاری کەرکوک قۆناغی ناوەندی و دواناوەندیی خوێندووە.

* لە شاری سلێمانی بۆ ماوەی چەند ساڵێک وانەی پەروەردەی هونەریی لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا وتووەتەوە.

* دامەزرێنەری مەڵبەندی چالاکیی قوتابخانەکانی شاری سلێمانییە.

* بۆ ماوەی ١٣ ساڵ لە شاری سلێمانی سەرپەرشتیاری پەروەردەی هونەریی بووە.

* ماوەی دوو ساڵ لە پایتەختی سعودیە وانەی هونەری وتووەتەوە و لەوێش بۆ یەکەمین جار

لە دەزگای وەزارەتی پەروەردە مۆزەخانەی
فۆلکلۆریی سعودیی دامەزراندووە.
* گرنگیی بە وێنەی منداڵان داوە.
* یەکەم دامەزرێنەر بووە بۆ شانۆی منداڵان
لەسەر ئاستی عێراق، بەتایبەت لە شاری
سلێمانی، هەروەها مۆزەخانەی فۆلکلۆریی
جلوبەرگی کوردی و عێراقی، هەروەها لە
دامەزراندنی مۆزەخانەی فۆلکلۆری زانکۆی
سلێمانیدا هاوبەشیی کردووە.
* ساڵی ١٩٦٥، یەکەمین پێشانگەی تایبەتی لە
زانکۆی ئەمەریکی لە بەیروت.
* ساڵی ١٩٧٢، دووەمین پێشانگەی تایبەتی لە
کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد لە بەغدا.
* ساڵی ١٩٨٧، پێشانگەی ڕێزلێنانی یەکەم لە
هۆڵی ڕەشید لە بەغدا.
* ساڵی ١٩٨٩، سێیەمین پێشانگەی تایبەتی لە
هۆڵی ڕەواق لە بەغدا.
* ساڵی ١٩٩٠، چوارەمین پێشانگەی تایبەتی لە
هۆڵی ڕەواق لە بەغدا.
* ساڵی ١٩٩٢، شەشەمین پێشانگەی تایبەتی لە
هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی.
* ساڵی ١٩٩٣، پێشانگەی ڕێزلێنانی پەرلەمان بۆ
کارە هونەرییەکانی لە هۆڵی میدیا.
* ساڵی ١٩٩٦، پێشانگەی ڕێزلێنان لە هۆڵی
میدیا.
* ساڵی ٢٠٠٠، پێشانگەی ڕێزلێنان لە میوانخانەی
چوارچرا- هەولێر.
* ساڵانی ١٩٥٩-١٩٩٣، بەشداریی زیاتر لە
٣٠ پێشانگەی هاوبەشدا کردووە لە (سلێمانی،
ئەڵمانیا، هەولێر).
* ڕۆژی ٢٠٠٢/٨/١٠ کۆچی دوایی کردووە.

# ئازاد شەوقیی
## مرۆڤ و هونەرمەند و مامۆستا

ئەنوەر قادر ڕەشید

نووسین دەربارەی کەسایەتییەکی درەوشاوەی هەمەلایەنە و خاوەن ئەزموونێکی وەک مامۆستا ئازاد شەوقی تووشی سەرەخولێت دەکات و نازانیت لە کوێوە دەست پێ بکەیت و باس لە کام لایەنی کەسایەتیی بکەیت، باس لە مامۆستایەکی دڵسۆز و خەمخۆری پەروەردەی هونەری یان دامەزراندنی چەندین دەزگای فەرمی و نافەرمیی کولتووری و بەشداری لە شانۆ و دامەزراندنی شانۆی منالان... هەموو ئەمانە لە پاڵ دەست و فڵچەی ڕەنگینی کە دەتوانین بڵێین وەک هەر هونەرمەندێکی جیهانی تایبەتمەندیی خۆی هەبووە و بە شێوازێک کاری کردووە کە تابلۆکانی ناویشیان لە سەر نەبوایە، دەناسرانەوە کە بەرهەمی مامۆستا ئازادن.

ئەگەر مامۆستا ئازاد هونەرمەندی هەر نەتەوەیەکی تر بوایە، مۆزەخانەی بەردەوامی تایبەت بە تابلۆکانی خۆی دەکرایەوە و بە سەدان توێژینەوەی زانستی و هونەرییان لەسەر ئەنجام دەدرا. بەڵام بە داخەوە، هونەری شێوەکارییش وەک هەموو کایەکانی تری کولتووری لە بازنەیەکی وتاری سەرپێییدا دەسووڕێتەوە، هەرچەندە لێرەولەوێ هەندێ توێژینەوەی زانستی دەکرێن، بەڵام لە کۆتاییدا توانای وێناکردنی سەرجەمی لایەنە هونەرییەکانیان نییە و نابنە بنەمایەکی زانستی بۆ پێناسەکردنی هەمەلایەنە، ئەمەش پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە نەبوون یان کەمیی سەرچاوەی ئەرشیڤکراوی زانستییەوە هەیە.

ڕەنگە بوترێ مامۆستا ئازاد تا ڕادەیەک دەرفەتی باشتری هەبووبێ بۆ

خۆناساندن بە هۆی ئەو دیدارانەی کە لەگەڵ خۆی ساز کراون یان خۆی نووسیونی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو دیدارانە ناتوانن ببنە بنەمایەکی زانستی بۆ لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی بەرهەمەکانی مامۆستا ئازاد، چونکە ئەوەی ڕەخنەگری شێوەکار دەتوانێ لە خودی تابلۆکان و ماوەی ژیان و ڕووداوە مێژووییەکانی ئەو قۆناغەوە زانیارییەکانی هەڵهێنجێ و بتوانێ توێژینەوەی تەواویان لەسەر بکات، ڕەنگە خودی هونەرمەند درکی پێ نەکردبێ، خۆ ئەگەر لەو تابلۆیانە بڕوانین کە لە بەردەستدا ماون و (بەختیار سەعید) لە دووتوێی کتێبەکەیدا دەربارەی مامۆستا ئازاد بە چاپی گەیاندوون، دەکرێ بڵێین یەک لەسەر دەی بەرهەمەکانیشی نین، ئەمە بێجگە لەوەی کە هەندێکیان بەرواری بەرهەمهێنانیان لە سەر نییە تا توێژەر بتوانێ بە ئاسانی قۆناغەکانی گۆڕانکاری لە تابلۆکانیدا بدۆزێتەوە.

وتراوە سیزانی عێراق یان سیزانی کورد، کە لەو بڕوایەدام ئەو چواندنە تەنیا لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ کە زۆربەی زۆری تابلۆکانی گوزارشتیان لە سروشت کردووە، ئەی جێی تێرامان نییە کە ئەو تابلۆیانەی مرۆڤیان تیایە، زۆر دەگمەنن؟ ئایا لە کوێوە وەڵامی ئەو پرسیارەمان چنگ ئەکەوێت؟ دەبێ وەڵامی ئەو پرسیارانە لای ڕەخنەگر و توێژەری شێوەکاری بن و ئیمەی بینەر و چێژوەرگر لە تابلۆکان دەتوانین سەرپێیی هەندێ لە سەرنجەکانمان بخەینە چوارچێوەی وتارێکەوە کە ناکرێ بخرێتە خانەی ڕەخنە یان لێکۆڵینەوەی زانستییەوە.

ئەوەی لە بەرهەمەکانی مامۆستا ئازاددا سەرنجی منی ڕاکێشاوە لە میانەی تابلۆکانی ناو کتێبەکەی (بەختیار سەعید) و پێشانگە تایبەتییەکەی بەغدا و ئەو تابلۆیانەی لێرەولەوێ بەرچاوم کەوتوون، ئەو تایبەتمەندییە لۆکاڵییەیە کە زۆربەی هونەرمەندانی جیهانی بە دنیا ناساندووە. بۆ نموونە، ئەو تابلۆیانەی سروشتیان تیا نەخشێنراون، زۆرن و بابەتەکانیش لە یەکترەوە نزیکن، هەمان شاخ و دۆڵ و ئاو و درەخت و گوڵ و گوڵزار و هەور و ئاسمان... هەموو ئەمانە بە شێوەیەک لە شێوەکان لە یەکترەوە نزیکن، بەڵام تایبەتمەندیی دەست و فڵچەی ڕەنگینی مامۆستا ئازاد دەمودەست کوردستانمان بیر دەهێنێتەوە، بە پێچەوانەی تابلۆکانی تر کە ڕەنگە زۆر جوان بن، بەڵام کوردستانیان تیا بەدی ناکەین. من لەو بڕوایەدام نهێنیی ئەو سیحری لۆکاڵییە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە بایەخی مامۆستا ئازادەوە هەبێ بە کەلەپوور و فۆلکلۆری کوردی، بە تەواوی هەست دەکەین کە دانان و دابەشکردنی ڕەنگەکان کوردین و سەرچاوەکەیان کۆمەڵگەی کوردییە، ڕەنگەکان هەر بەو شێوازە دانراون کە لە بەرەی کوردی و پۆپەشمین و کڵاو و جلوبەرگ و بێشکەی منداڵان... دانراون.

ئەگەر لەو مەتریاڵە کەلەپوورییانەدا شێوە زەقییەکی ڕەنگە گەرمە تێکئاڵاوەکان هەبن، ئەوا هونەرمەند نەرمی و ئارامییەکی پێ بەخشیون و ڕێگەشی نەداوە لە سنووری کوردییەکە دەربچن، ئەو توانای دەربڕینە کوردییە تەنانەت لەو تابلۆیانەشدا دەبینرێ کە نەخشێنراوی ئەهوار و ناوچە عەرەبییەکانن. مامۆستا ئازاد چونکە عاشقی هونەرەکەی بووە، بەردەوام لە خۆقاڵکردن و ڕۆچووندا بووە بۆ قووڵایی کۆمەڵگەی کوردی و بووە بە گەڕیدەیەک بە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا، وەک خۆی نووسیوێتی (بایەخی زۆرم بە سامانی میللیی کوردی داوە بۆ ئەوەی باسەکانم بەهێز بکەم. هەمیشە پیاوانی ڕیشسپی و دنیادیدەم دیوە و دێهاتەکان گەڕاوم و پرسم کردووە دەربارەی خواردەمەنی و جلوبەرگ و گژوگیا و داوودەرمان و لاوک و حەیران و گۆرانی و لاواندنەوە و لایلایەی منداڵ...) کتێبی (ئازاد شەوقی) ئامادەکردنی بەختیار سەعید، ل 30.

مامۆستا ئازاد نەهاتووە دەقاودەق سروشتمان

بۆ بگیرێتەوە، چونکە ئەوە کاری کامێرایەکی بێهەستە، بەڵام کاری هونەرمەند ئەوەیە لە چاوی هونەریی خۆیەوە سروشت بونیاد بنێتەوە و خوێندنەوەیەکی پڕ لە هەست و سۆزی هونەرمەندانەی بۆ بکا. ئەو ڕاستییە لە پۆترێتدا زیاتر هەستی پێ دەکرێ کە ڕەنگە کامێرا لە چەندین ملیۆن گرتەشدا نەتوانێ ئەو چرکەساتە بنوێنێ کە دەلالەت لە ناخ بکات، بەڵام هونەرمەندی شێوەکار ئەو چرکەساتە دەکاتە بابەتی هونەری و شیکردنەوەی دەروونی بۆ ئەو کەسایەتییە دەکات. بۆیە ئەو لایەنە شاراوانەی ڕووبەری تابلۆیەک ئەرکی کەسانی پسپۆڕە لە بواری هونەری شێوەکاریدا کە لێکۆڵینەوەی تەواو زانستی بۆ بەرهەمەکانی مامۆستا ئازاد و هەر هونەرمەندێکی شێوەکاری تر بکەن و بتوانن بە تەواوی لە قۆناغەکانی دەستپێک و بەردەوامیی کەڵەکەبوونی ئەزموونیان، بە جیاکردنەوەی بەروار و بەکارهێنانی مەتریاڵ و شێوازی بەکارهێنانی فڵچەش، ڕادەی کاری ئەکادیمی و بەرەوپێشچوون و گەشەکردنی توانای دەربڕینیان بخەنە چوارچێوەیەکی ئەکادیمی و زانستییەوە.

مامۆستا ئازاد ئەزموونێکی داهێنانی دوورودرێژی هەبووە و مامۆستای مامۆستاکانی بواری شێوەکاری بووە، بە تەواوی زانیوێتی چۆن تابلۆکانی بنەخشێنێ و بە چ ئاڕاستەیەک کار بکات، ئەوەندە دڵسۆزی پیشەکەی بووە، سەرنجی کەسی پشتگوێ نەخستووە و هەر وەک خۆی دەڵێ: (جێی شانازیمە کە ناوبەناو هاوڕێکانم لە ئەدیبان و هونەرمەندان دیدەنیم دەکەن، نایشارمەوە دەڵێم توانای هونەریم بە سەرنجە بەسوودەکانیان بەهێزتر دەبێ، چونکە لەتەکما دەکەونە گفتوگۆ لەسەر بەرهەمەکانم. بە ڕێزەوە گوێ بۆ بیروڕا و ڕەخنەکانیان شل دەکەم، ئا لێرەوە هەست دەکەم ڕێبازی هونەریم ڕوونتر دەبێ و بەرهەمەکانم زیاتر دەچنە دڵی خەڵکییەوە). هەمان کتێب، ل 36.

بە داخەوە، لای ئێمە بازرگانیی هونەرییشمان بە هۆی لاوازیی متمانەمان بە چێژی هونەرییەوە لە نرخی نەبوانە و نەمانتوانیوە وەک بازرگانە هونەرییەکانی وڵاتان هونەرمەند و بەرهەمی هونەرمەندانمان بە خۆمان و دەرەوەی خۆمان بناسێنین، وەک ئەوانەی دڵسۆزی کولتووری نەتەوەکەیانن و دەیکەنە پیشە، ئەوانە دەبنە سەرچاوەی زانستی و دەکرێ ببنە هاوکارێکی سەرەکیی توێژینەوە زانستییەکان و پێکگەیاندنەوەی جەمسەرە هونەرییەکان و پڕکردنەوەی بۆشاییە ونبووەکان، بۆ نموونە، کەسێک لە ئێمە داڤینشی و دالی و پیکاسۆ و ڤان گۆخ و سیزان و ڕێمبرانت و ڕێنوار و... نەناسیوە و ڕەنگە کەمێکمان دەرفەتی بووبێ لە مۆزەخانە بەناوبانگەکان یان پێشانگە جیهانییەکاندا بەرهەمی یەکێک لە کەڵە هونەرمەندەکانی جیهانی دیبێ، بەڵام ساڵانە چاپی دەقاودەقی بەرهەمە جیهانییەکان (هەندێ جاریش بە قەبارەی تەواوی خۆیان) بە نوێترین تەکنیکی چاپەمەنی دەکرێن بە ڕۆژژمێر و پۆستەر و کارتی بۆنەکان و بە زانیاریی تەواوی قەبارە و بەرواری بەرهەمهێنان و مەتریاڵی بەکارهاتووەوە دەخرێنە بەردەستی هەوادارانی ئەو هونەرە، ئایا وەک پیشە و پارەپەیاکردنیش بێ، کەسێکی کورد بیری لە پرۆژەیەکی لەو جۆرە کردووەتەوە؟

ئازاد شەوقی

# پیاوێك له ڕەنگی ئەرخەوان

**دکتۆر ڕێبوار سەعید**

بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٩٣ لە شاری سلێمانی پاش گەڕانەوەم لە لەندەن سەردانیماڵەکەیم کرد. هەرچەند زۆر پێشتر لە ڕێگەی نامەوە پەیوەندیمان گەرم بوو و هەمیشە لە نامەکانیدا خەم و ئازارەکانی خۆی بۆ بەیان دەکردم، بۆیە ئەو دیدارە کە دوادیداریشم بوو لەگەڵیدا، یادەوەرییەکی نەمری لام جێ هێشت، بەتایبەت لەو سەردەمەی کێشەکانی زۆنی زەرد و سەوز لە هەڵچووندا بوون. ئەم وەک هونەرمەندێک خەمی گەورەی بە ئازاری ئەو برینە قووڵانەوە دەچەشت. لەو دیدارەدا هەستێکی نائومێدی و بەپاشکۆخستنی دڵسۆزییەکانیم بە ڕوونی دەبینی کە چۆن هونەرمەند و ڕۆشنیری ئێمە دەکەونە بەر بەرداشی هەڵبژاردن یان لەیبڵێدان بۆ

لایەنێکی دیاریکراو یاخود ڕەوتێکی سیاسیی دیاریکراو بەبێ گوێدانە خەمە گەورەکەی هونەرمەند کە جیهان بۆ ئەو یەک وڵاتە و لە هەوڵی تێکشکاندنی سنوورە دەستکردەکانی نیشتماندایە بە تێکڕای ڕەنگە جیاوازەکانیەوە.

پەروەردەبوونی ئەم هونەرمەندە لە فەزای خێزانێکی هونەردۆستدا خاڵێکی گەشەکردنی فیکری مەعریفەی هونەرییە، چونکە باوکیان (بە وتەی ئازاد شەوقی) حەزی بە وێنەکێشان کردووە و جارجارەش وێنەی کێشاوە.

پاشان ئازاد شەوقی خۆی دەبێتە هەوێنی دروستبوونی کەشێکی هونەری لە ناو خێزانەکەیدا و دەتوانێت کاریگەری لەسەر خوشک و براکانی دروست بکات، پاشان ئەم کاریگەرییە دەپەڕێتەوە بۆ چەندین هونەرمەندی تر، ئیدی پەیامی ئەم کارەکتەرە ڕۆشنبیرە بە ئاشکرا پێگەی لەسەر کەسانی دی دادەنێت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەوەیە لە سەفەری ئەزموونی هونەریی چەندین ساڵەیدا لە ڕێگەی جیهانبینییە تایبەتییەکەی خۆی کە ئاوێتە بووە بە بەرجەستەکردنی سروشتی وڵات و پاککردنەوەی لە ئەو شەقڵ و تەپوتۆزانەی کە ڕوخساری وڵاتیان داپۆشیوە، بەرگێکی ئینسانی بە ڕەنگی تابلۆکان ببەخشێت، زۆر جار کۆنتراستێکی سەیر لە نێوان داهێنانەکان و خودی کەسەکاندا دەبینرێ. من بۆ خۆم هەمیشە حەزم بەو بەرهەمانەیە کە لەگەڵ کەسایەتیی هونەرمەندەکەدا نزیک دەبنەوە و دەبنە تانوپۆی یەکدی، هەر بۆیە ئازاد شەوقی لە یادەوەری و ناسینی مندا ئەو پێکهاتە گرنگە بوو.

سەفەری ئەم هونەرمەندە بە دێهاتەکانی کوردستان و کۆکردنەوەی ڕەنگی سروشت و نەخشاندنی شاخ و دارستان و ئاسمانی وڵات و بەرجەستەکردنی دنیای پڕ ژیانی دێهاتەکان یەکێکە لە پێگە گرنگەکانی ئەم هونەرمەندە، وێڕای ئەوەی هەندێک لە بەرهەمی فیگەر و بابەتی خەباتی ڕزگاریخوازانەی نیشتمانی دیوێکی دیکەی خوێندنەوەی بەرهەمەکانیەتی.

ئەوەی لە بەرهەمەکانی ئەم هونەرمەندەدا دەبینرێت، کەمیی ئامادەگیی فیگەرەکانە، ئەمەش بە واتای گەیاندنی ئەو پەیامەیە کە دەڵێت: ئەم سروشتەتان بۆ دێنمە قسە و چیرۆکەکانتان لە ڕێگەی گەلا و دارستان و ئاسمان و ڕێگە و چیاکانەوە بۆ دەگێڕمەوە، بە واتایەکی دی، ئەم سروشتە لەسەر دەستی ئینسانەکان دەپارێزرێت و هەر لەسەر دەستی ئینسانەکانیشە دەبێتە

ئازاد شەوقی

سوتماگ، وەک دادوەرێکی بەویژدان لەسەر چەمکی سروشت دەمێنێتەوە و دەڵێت: گەر کات هەبوو، لە داهاتوودا تابلۆکانم بۆ کێشانی وێنەی ئینسانەکان تەرخان دەکەم.
ئەو ڕەنگانەی لای هونەرمەند خۆشەویست بوون، هەمان ئەو ڕەنگانەیە کە لە تابلۆکانیدا بەکاری هێناون، وەک ڕەنگی: پەمەیی، پرتەقاڵی، وەنەوشەیی و شین. گەر بچینە ناو کەشی سروشتی کوردستانەوە، بە هەمان شێوە ئەم ڕەنگانە دەبینینەوە کە بوونەتە پالێتی ڕەنگەکانی.
ئەو ڕەنگەی لە زۆربەی بەرهەمەکانی ئەم ساڵانەی دواییدا زاڵە و پانتاییەکی فراوانتری داگیر کردووە، بەکارهێنانی بۆیەی ئاوی و ئەکریلیک و گواشە، وەک خۆی دەڵێت: ڕەنگە ڕۆنییەکان کوالیتییان باش نییە یاخود لێرە چنگ ناکەون، بۆیە پاش ماوەیەک ڕەنگەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت و ئەمەش بۆ هونەرمەند مایەی نیگەرانییە.
ئەم هونەرمەندە تەنها لە ناو کارەکانیدا جیهانەکەی خۆی کۆ نەکردووەتەوە، بەڵکو وەک کەسایەتییش هەوڵی داوە لە لایەک تێکەڵ بە بوارەکانی پەروەردە و شانۆ ببێت و لە لایەکی دیکەش بەشدار بێت لە دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان و دروستکردنی مۆزەخانە بۆ هونەری کوردی و دامەزراندنی گۆڤاری ئەدەبی و هونەری و بڵاوکردنەوەی بابەتە هونەرییەکان.
بوونی کەسایەتیی خۆی و کاریزمای ئەم هونەرمەندە، تێکەڵبوون و بەشدارییەکانی، گرێدانی پردی پەیوەندییەکانی لە نێوان هونەرمەندان و نووسەران و شاعیرانی کورد و عەرەب وەک کەسێکی کۆمەڵایەتی پێگەی دیاری هەبووە، میواندارێکردنی هونەرمەندە ناودارەکانی عێراقی، لەوانە فایەق حەسەن، کاریگەرییان لەسەر ڕۆشنبیریی هونەری کوردی دروست کردووە.
ئەوەی جێگەی سەرنجە لە زۆربەی تابلۆکانیدا کە لەسەر تێمای سروشتن، تەنها سروشت ئامادەگیی هەیە، مرۆڤ، تەنانەت باڵندە و ئاژەڵ، بونیادەکانی تری ناو سروشت بێحزورن و لەبەر گەورەیی سروشت شاردراونەتەوە.
ئەم هونەرمەندە وەک کەسایەتییەکی بەئاگا لە بواری ڕۆشنبیری و تەنانەت پێگەی هونەرمەندان لە ناو بزاڤی ڕۆشنبیریی هونەریدا ژیرانە مامەڵەی کردووە و هەوڵی داوە هونەر و داهێنان نەبنە پاشکۆی چەمکە ئایدیۆلۆژییەکان، نەبادا زمانی خۆیان لە دەست بدەن.
لە کۆتایدا ئەم هونەرمەندە لە سەفەری دوورودرێژی هونەریدا ئەو پەیامە ڕادەگەیەنێت (داهێنان سەدان دەروازەی هەیە. کاتێک هونەرمەند بە باوەڕەوە بابەتەکانی وێنا کرد، بابەت دەبێتە قسەی دڵ و قسەی دڵیش بە ئاسانی دەتوانێت بگاتە ئەو دڵانەی کە دەتوانن خۆشەویستی ئاو بدەن).

# پێشانگەی "كاروان"

## هونەرمەند ئازاد مەحمود شەوقی

**ئازا حەسیب قەرەداخی**

(سروشتم خۆش دەوێ و سەرچاوەی هەموو هەستێكی هونەریمە). ئا بەم وتەیە و چەندان تابلۆی ڕەنگئاوی، مامۆستای هونەرمەند "ئازاد شەوقی" گەڕایەوە مەیدانی هونەری تەشكیلی، پاش ساڵەهای ساڵ بێدەنگی و بەبێ بەشداریكردن لە پێشانگە هونەرییەكاندا.

هونەرمەند لەم تەمەنەیدا تا بڵێی بەجەرگ و ئازایە لە كارە هونەرییەكەیدا، بە جۆرێ، بەكارهێنانی فڵچە و ئەو ڕەنگە ئاوییانەی زۆربەی تابلۆكانی پێ دەنەخشێنێ، ڕاستیی ئەو ئازاییەتییەمان بۆ دەسەلمێنێ، چونكە هونەرمەند زۆر چاك دەزانێت كە جێبەجێكردنی تابلۆیەک بە ڕەنگی ڕۆنی ئاسانتر و ڕەخساوترە لەوەی بە ڕەنگی ئاوی ئیشی تێدا بكرێت، كەچی هونەرمەند سوورە لەسەر ئەوەی بەو مادە چەسپاوەی لە ماوەیەكی زۆر كەمدا جێگیر دەبێ و وشک دەبێتەوە، بەرهەمە هونەرییەكانی بەرهەست بكات.

هونەرمەند كارەكەی هێندەی تر گران كردووە، بەوەی ئەو ڕەنگە ئاوییە بە شێوەی ڕۆنی بەكار دەهێنێت و شوێن فڵچەی خەست و تۆپەڵ

لە سەر تابلۆکانی جێ دەهێڵێت بە پێچەوانەی بەکارهێنانە ڕوون و شەفافەکەی ڕەنگی ئاوییەوە. بێجگە لەمە، هونەرمەند فڵچەی ڕەنگە ڕۆنییەکان بەکار دەهێنێت، کە پان و تاڵکورت و پڕن، بە پێچەوانەی فڵچەی ئاوییەوە کە نەرم و تاڵدرێژن.
بەم جۆرە، هونەرمەند دەیەوێت سەرپێچیی تەمەن و ئەو مادەیەی بەردەستی بکات، بۆ ئەوەی بە ئێمەی بینەر بسەلمێنێ کە توانا و هەست و دەروونی هونەرمەند پیر نابن، وەک ئەو سروشتەی هەمیشە دەینەخشێنێ و بووە بە بابەتی سەرەکیی تابلۆکانی.
مامۆستا ئازاد لەم تەمەنەیدا چەند بڵێی ناسک بووەتەوە و چەشنی دێوانەیەکی شەیدا و عاشق بەرامبەر بە تەنیا خۆشەویستەکەی ڕاوەستاوە و هەردەم دەروونی کردووە بە خەڵوەتی ئەو عیشقە و ناسکی و پاکی و قەشەنگی ئەوی تیا دەنەخشێنێ. ئەو خۆشەویستەی هەرچۆنێک و بۆ هەر لایەکی ئەم کوردستانە بڕوانین، لە بەرچاومانە و ئێمەش هەر یەکێکمان کەم تا زۆر شەیدا و تامەزرۆی جوانیی ئەو خۆشەویستەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە چەند کارمان تێ دەکات و ئێمەش چەند ئاوێتەی ئەو کارتێکردنە دەبین و هەستێکی ناسک و ڕەنگاوڕەنگ دەبێتە پەرچەکرداری ئەو ئاوێتەبوونە.
بۆیە سروشتە قەشەنگەکەی کوردستان خۆشەویست و ڕەمزی عیشق و جوانییە لای هونەرمەند، ئەو سروشتەی خۆی بۆ خۆی بەرهەمێکی هونەریی زکماکی گەردوونە و تا چاو بڕ بکات ڕەنگ و فیگەری هەڵچوو و باڵابەرزە، داربەڕووی پیر و پڕ و خۆڕاگر، سنەوبەری هەمیشە سەوز و باڵاهەڵچوو، چنار و بیی پۆشتەی زەردی پاییزان، چیای سەخت و گەردنگەش و تاشەبەردی گەورە و سەنگین، سپی وەک بەفر، سەخت وەک یاسایەکی جێگیر و نەلەقاو، یەک لە پاڵ ئەوی تردا و یەک لە باوەشی ئەوی تردا وەک عاشقانی هەزاران ساڵە، سەربەرز و چوارشانە چەشنی لاوێکی بەجەرگ و هیوا و جەرزە، سنگقیت و دەرپەڕیو، چەشنی کیژێکی قەشەنگی چواردەساڵە، سپیپێست، جەستە پڕ جاڕ و تەزووی بێپایان، قیتوقنج هەر لە بنارەوە تا لوتکە، تاشەبەردێ کە هەموو جەستەی دەلاقەی هەوەسبازییە و لە هەموو لایەک چۆڕاوگەی ئاو و کانیی ساردە و سەر دەکات و تا دەگاتە گوێ چەمێ، یاری دەکات و دەپرژێت و بریسکەی دێ.
ئەم سروشتە هەمیشە دەوڵەمەندە، جێنزرگە و هەڵچوونی دەروونی و هونەریی هونەرمەندە و چاوەکانی هەروا لە گەڕاندایە تا بزانێ لە کام لایە ئەم خانمە، یەکاویەک قەشەنگیی خۆی دەنوێنێ، تا وێنەی بکێشێ، لێرە یا لەوێ؟ لە ناو ڕێی تاقتاق و گوزەری سەختی قەد چیاکاندایە؟ یا لە گوێ چەم و هەڵبەزە و قەڵبەزەی وردەشەپۆلی سپی و پاکژدایە؟ یا لە ناو چڕوپڕیی گەڵای داربەڕووەکاندا خۆی حەشار داوە؟
لە چ کاتێکدایە؟ لەوانەیە لە بەهاردا بێت و جوانیی خۆی ئاوێتەی ئەو چڵە گیا وردیلە سەوز و پرتەقاڵییانەی دەم کانییەکەی (کانی سارد) کردبێ؟ یا لە ناو بەفری نەتواوەی سەر ئەو تاشەبەردە کەڵەگەتانەی دەستەچیای کۆسرەتدا بێت کە چەشنی پاسەوانێ ڕووبەڕووی چایخانەکانی (کانی وەتمان) ڕاوەستاون؟ لەوانەیە لە زستاندا بێت و ئەو هەمووە بەفرە سپییە، جەستەی بێگەرد و بێئەندازە ناسکی ئەوین؟ یا هەر گەڵایەکی زەردی پاییز دەشێ چاوانی ئەو بێت و هەر گردێکی گۆشتی ڕەنگ گۆی مەمکەکانی ئەو بێت؟
هەیهات، هەموو ئەمانەی وێنە کێشاوە و کەچی هێشتا هونەرمەند نازانێ نهێنیی جوانییەکەی ئەم خانمەی لە کوێیە. چ ئازارێکی پڕ ئەندێشەیە ئەم هەوڵەی، دوای ئەم تەمەنە، چ خەیاڵێکی بێپایانە وا هونەرمەندی سەرگەردانی ئەم عیشقە کردووە؟ چی دەوێت لەم سروشتەی هەردەمە بە بەرگ و ڕەنگ و بۆیەکەوە خۆی دەنوێنێ؟ جارێ ناسک و هێمن، جارێ سەخت و دژوار. بۆچی هونەرمەند

ئازاد شەوقی

دەروونی خۆی خستووەتە دوای ئەم سروشتە ئەفسووناوییەی هەرگیز خۆی بە دەستەوە نادا؟ ئەم عیشقەی مامۆستا گرفتارییە، عیشقێکی وەها دەبینم گەیشتووەتە ئەوپەڕی خۆشەویستی، تەنیا هونەرمەند و سروشتی خۆشەویستی و بەس، کەسی تر لەم ڕووبەرەدا بوونی نییە، وەک بڵێی هونەرمەند نەیەوێت مرۆڤی لەم عیشقەیدا بەشداری بکات و لەم سروشتە قەشەنگەی بەرچاویدا ئامادە بێ. دابڕینێکی سەیروسەمەرە بەدی دەکەین لە مابەینی سروشت و مرۆڤدا. هونەرمەند هەر هێندە ڕێ بە مرۆڤ دەدات کە بینەر و بونیادنەر بێت لە سروشتا، یا با بڵێین پێویستیی بە ئامادەبوونی مرۆڤ نییە لە تابلۆکانیدا، تەنیا پێویستیی بە شوێندەستی مرۆڤ هەیە لە دروستکردنی خانووبەرە و بونیادنانی دێهاتەکاندا و لە چاندنی دار و درەخت و لە بڕینی ڕێگە و دەلاقەکاندا، لە هەڵبژاردنی ئەو جێ و شوێنانە بۆ ژیان و گوزەران. هونەرمەند تەنیا پێویستی بە زەوق و سەلیقەی زکماکی ئەو خەڵکە هەیە لە ئاوەدانکردنەوە و هەڵبژاردنی شێوە و ڕەنگی شمەکی پێویست بۆ گشت بۆنە و بوارەکانی ژیانیان. ئەمەندە و چیتر نایەوێت هیچ یەکێ لەوان وەک فیگەرێکی جوڵاو و کارمەند لە تابلۆکانیدا ئامادە بن. بەڵام سروشت بۆ ئەم عیشقە دابڕاوەش، وا بە ئاسانی نهێنیی خۆی بە دەستەوە نادا. هونەرمەند خۆشی ئەم حەقیقەتە دەزانێ، بۆیە چەندی خۆش دەوێت، هێندەش توندوتیژە لەگەڵیدا. هونەرمەند دڵبریندارە و داوای مافی خۆی دەکات، هەر ئەم داوایەشە بووە بە مایەی توندوتیژییەکەی.

دەست و فڵچەکەی ڕەق و توندهاوێژە، خاڵێ نییە هێڵی ڕاکێشانی فڵچەکانی لێوە دەرپەڕێت یا تیا بگرسێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەر فڵچەیەکی لە خاڵێکی سەربەخۆ و ناهۆشیارانەوە بە توندی دەردەپەڕێت و لە خاڵێکی لە خۆی سەرشێتانەتردا جێگیر دەبێتەوە، ئەوەش بووە بە هۆی ئەوەی هێڵێکی جێگیر لە ناو تابلۆکانیدا بەدی نەکەین و هەر هێڵە بۆ خۆی هێڵێکە و سەربەستە لە ڕاکێشان و خۆبڕیندا، بەتایبەتی لەو تابلۆیانەدا کە زیاتر بە (تخطیط) دەچن و بە قەڵەمی ڕەش کێشراون، ئاوا لەوانەدا، گێژاو و گێژەڵووکەیەکی سەرسووڕهێنەرە و ئاڵۆزکاوییەکی بێهاوتا بووە بە ماددە بینراوەکەی بەرچاومان، گەرچی لەمانەیاندا مرۆڤی کردووەتە فیگەر، بەڵام تەنها سەرابێکن و لە ناو ئەو گێژاوەدا بە ئاستەم شێوەیان دەکەین.

لە تابلۆ ڕەنگئاوییەکاندا بە دەگمەن هارمۆنیی نێوان دوو ڕەنگ دەبینین، گەر هەشبێ، ئەوە تەنیا ئەوەندەیە کە دەشێ دوو ڕەنگ دوای یەک دوو پلە لێک نزیک ببنەوە، ئەگینا زۆربەی ڕەنگەکان کۆنتراست و دژبەیەکن، زەردێکی لیمۆیی لە پاڵ مۆرێکی تێرا، پرتەقاڵییەکی ڕۆشن لە تەک شینێکی تۆخا، سوورێکی گەش لە پاڵ سەوزا... هەر هەموو ئەمانەش لە ڕووبەری گەورە یا بچووکدا دامەزرێنراون و گرنگیی زۆریان پێ دراوە، کە دەشێت ئەگەر هەندێ ڕتوش لە فیگەرەکاندا بکرێت و کەمێک لە شکڵە واقیعییەکانیان دوور بخرێنەوە، ئەوا ئەو ڕووبەرە ڕەنگییانە ببنە تابلۆیەکی تەجریدی.

ئەمە و لەمە بەسەرنجتر ئەوەیە کە تابلۆکانی هونەرمەند گەلێک ڕۆشن و بریقەدارن، کەچی ئاسمان کە جێی سەرچاوەی تیشک و ڕووناکییە و هەمیشە لە تابلۆی هونەرمەندە ئینتباعییەکاندا ڕووبەرێکی گەورە داگیر دەکات، لای مامۆستا ئازاد ئەو ئاسمانە تەڵخ و پیس و بۆرقینەیە، یا

لاکێشەیەکی تەسکە و هەورێکی چڵکن تەنیوەتی، یا سێگۆشەیەکی دابڕاوە و پڕە لە ڕەنگی ژەنگدار یان خۆڵەمێشی. ئەم مامەڵە دژوارە لەگەڵ ئاسماندا لای هونەرمەندە ئینتباعییەکان سەیر و نەگونجاوە، چونکە دەڕوانیتە فیگەرە سروشتییەکانی ناو تابلۆکان، ڕووناک و بەبریقەن، گەڵاکان سەوز و تەڕ و ڕۆشنن، کانی و چەم و گۆماوەکان بریسکوهوڕیانە و عەکسی دەوروبەرەکەیان لەخۆ گرتووە، کەچی ئاسمان تەڵخ و پڕهەورە، دەسا چۆن ئەم دژوارییە دەگونجێ؟ کە ئاسمان وەها بێت، ئەدی ئەم هەموو تیشکە لە کوێوە هات وا ئەو ناوەی ڕووناک کردووەتەوە؟ پرسیارێکە و وەڵامی پێویستە!!

من دەڵێم، ئاخۆ عیشقەکەی هونەرمەند گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی کە تەنانەت غیرە لە خۆریش بکات و ڕەتی بکاتەوە و نەیەوێت بەشدار بێت لە سروشتەکەیدا و لە جێی ئەو خودی خۆی بکاتە سەرچاوەی ڕۆشنکردنەوەی جەستەی خۆشەویستەکەی و لە دەروونی خۆیەوە تیشک بە سەر ڕووبەرەکەی بەرچاویدا پەخش بکات و ڕووناکی بکاتەوە؟!!

دەتوانین بۆ ئەوەش بچین کە مەسەلەکە پەیوەندیی بە باری سایکۆلۆژیی هونەرمەندەوە هەیە و خۆی درک بە حەقیقەتی عیشقەکەی دەکات و بە چەشنی ئەو ئاسمانە تەڵخ و پڕهەورانە خۆی دەبینێت، کە سەرەڕای ئاڵوواڵایی سروشتەکەی خۆشەویستی، ئەم ڕووبەرێکی بچووک و نامۆ و ڕەنگ چڵکنە و باوەشی بە سەر ئەم سروشتەدا کردووەتەوە.

هونەرمەند دەڵێ: (سروشتی کوردستان تا بڵێی دەوڵەمەند و بەخشندەیە لە جوانی و ڕەنگدا، دڵفراوانە لە بەخشینیاندا بە هونەرمەندان، بۆیە هەمیشە خۆم بە قەرزار و کەمتەرخەم و بێتوانا دەزانم کە ناتوانم بەشێکی بچووک لەو بەخشینە بێپایانە بۆ سروشت لە تابلۆکانمدا ڕەت بکەمەوە).

ئەم وتەیە تەفسیری مەزنێتیی عیشقەکەی هونەرمەندمان بۆ دەکات، بەڵام ئاخۆ ئەو هەموو تابلۆیە جێی ڕەزامەندی نین؟ جێی سەرفرازی و توانایی هونەرمەند نین بۆ ڕەتکردنەوەی خزمەتی جوانییەکەی سروشت؟! ئیتر بۆ خۆی بە قەرزار و کەمتەرخەم دەزانێ؟!

سەرجەم وای بۆ دەچم کە ئەو مەسەلەیە (سروشتی ئاڵوواڵا، جێ فڵچەی توندوتیژ، ڕەنگی دژبەیەک و ئاسمانی تەڵخ و تەسک) جۆرێکە لە هەڵسەنگاندنە و تەعبیرکردنێکی مەجازییە بەرامبەر بە ژیان.

هونەرمەند سروشتی خۆش دەوێت و ئەوەش سروشت کە دەیزانین، بە هەموو وردەکاری و دژواری و جوڵە و گۆڕانەکانیەوە، هەر بە چەشنی ژیان، ئەو خۆشەویستییەش زۆر کەوتووە لەسەر هونەرمەند و ئازار و ئەشکەنجەیەکی ئێجگار گەورەی لە ناخیا جێگیر کردووە و لە بارودۆخێکی وەها سەختدا ژیاوە کە ناتوانێ بە نەرمونیانی تەعبیری لێ بکات و دەیەوێت تابلۆکانی ڕەنگدانەوەیەکی واقیعی بن بۆ ئەو دژواری و غەم و پەژارەیە (جێگە فڵچەی توندوتیژ و ئاسمانی تەڵخ و ڕەنگە کۆنتراستەکان)، لە هەمان کاتیشدا هیوا و خۆشەویستی و جوانی هەر هەن و بەردەوامن (ئاڵوواڵایی دەشتودەر، سەختی و خۆڕاگری و سەربەرزیی تاشەبەرد و چیاکان)، هونەرمەند دەیەوێت ئەمانەمان وەک وەسیقەیەکی مێژوویی بۆ تۆمار بکات و جێی بهێڵێت بۆ نەوەکانی دوای خۆی، هەر بۆیە دەڵێت:

(گەرچی تابلۆکانم سروشتێکی موجەڕەدن، بەڵام مەبەستم لەوە نییە کە من تەنیا چێژ لە سروشت ببینم و هەوڵ بدەم نەمری بۆ ئەو دابین بکەم، بەڵکو لە سروشتی موجەڕەد جوانتر لە لای من شوێندەست و کرداری مرۆڤە لە سروشتا).

ئەم وتەیە ئەوەمان بۆ یەکالا دەکاتەوە کە مامەڵەکردنی هونەرمەند لەتەک سروشتا دیوی تەعبیری و ڕەمزیی مامەڵەکردنێتی لەگەڵ ژیاندا. کەواتە هونەرمەند سروشتمان لە دەرئەنجامی کرداری مرۆڤەوە پیشان دەدات، بەڵام ئەی بۆچی مرۆڤەکە خۆی ئامادە نییە لە تابلۆکانیدا یا

دەگمەنن؟

گەرچی هونەرمەند دەزانێ کە ژیان و سروشت بەبێ ئامادەنەبوونی مرۆڤ هیچ مانایەک نابەخشن و بێهودە و نابەجێن، کەچی هێشتا هەر سڵ لە مرۆڤ دەکاتەوە و دەترسێت لە تابلۆکانیدا ئامادەیان بکات، تەنانەت لەوانە کە نیگاری دێهات و هاوینەهەوار و چایخانەکانیشن، چونکە هونەرمەند وا دەزانێت کە هەر ئەو مرۆڤەی ئەم سروشتە ئاوەدان دەکاتەوە و دەگونجێنێ بۆ ژیانێکی بەختیار و سەربەست، هەر ئەویشە دەیکاتە وێرانە و خۆڵەمێش.

سەرەڕای ئەم تەفسیرانەش، هونەرمەند هەوڵ ئەدات دوو مەبەستی تریش بەجێ بهێنێت، یەکەمیان: دامەزراندنی بناغەیەکی ئەکادیمی و کامڵ بۆ ئەو هەڵبژاردنە هونەرییە زکماکییەی خەڵکی کوردستان، لە جێ و ڕێی ژیانیاندا و ڕەنگی گشت شمەک و جلوبەرگەکانیاندا، بەو نیازە کە ئەو هەڵبژاردنە ببێتە هەڵبژاردنێکی زانستی و پتەو، ئەمەش بووە بە پاڵپشتیی هونەرمەند بۆ ئەوەی بەو واقیعییەتە ئیش بکات. دووەمیان: وەک پسپۆڕێکی جوگرافی ئەو ناوچە و دێهاتانەی کوردستان نەخشە بکێشێت نەبادا ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاسەواریان نەمێنێت و بسڕێنرێنەوە. بۆیە بە هۆی کارەکەیەوە بۆ هەر لایەک چووبێت، کە سەرپەرشتیاری هونەری بووە لە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی سلێمانی، خێرا وێنەی کێشاون، جا هەر لە خانووە تێکسمڕاو و هەڵچووەکانی تەوێڵە و بیارەوە بۆ ئەحمەدئاوا و پێنجوێن و بۆ چایخانەکانی کانی وەتمان و ڕێگەی دوکان و ڕانیە و خەلەکان و بێتواتە و هێرۆ، بۆ ئاغجەلەر و سەنگاو، قەڵای هەولێر و کەرکوک.

لە کۆتاییدا دەڵێم، هونەرمەند ئازاد شەوقی وەک کانییەکی کوێرکراوە، دیسانەوە هەڵدەقوڵێت و ئەم جارەیان زۆر بە کەیف خۆشی و بەپەلە سەر دەکا و بە نێو درز و دەلاقەی تاشەبەردەکاندا وەک تاڵەدەزووی تێکئاڵاو ڕۆدەچێتە ژێر قەدی داربەڕوو و چنار و بی و سەرووەکانەوە و خۆی بە ناو کێڵگە و دەشت و سەوزە گیاکاندا واڵا دەکاتەوە و لە ئاکامدا پاش ئەوەی خۆی لە پاکی و ناسکی و قەشەنگی تێر دەکات، یەک دەگرێتەوە و دەڕژێتە ناو ئەو دەریارە مەزنەوە کە خۆشەویستییەتی بۆ ژیان و کوردستان.

ئازاد شەوقی

# سروشت لە دیدە جیاکانەوە...!!

## نەهرۆ شەوقی

تابلۆی زیاتر دەکێشیت
تاکو مەرگ درەنگتر بتبات
تۆی یاریزان
لەگەڵ درەوشانەوەی یەکەمین ڕەنگ
بەسەر مانادا باز ئەدەیت
بەسەر ژیاندا باز ئەدەیت
چەند جوانیت، کە یاری ئەکەیت
بەڵام دڵنیا بە ڕەنگێکی تر نابینیت

ئەو دەبوایە دیمەنە ڕەنگینەکانی کوردستان بکێشێ، ئەو وێنانەی هەردەم لە یادەوەرییەکانیدا زیندوو بوون تا ئەو ئاستەی کە نەیدەتوانی خۆی لێیان دەرباز بکات.
بابەتی ئەو کەسەر و نەهامەتییە گەورەیە بە درێژایی نیو سەدە دەبێتە کۆنسێپتی ڕاستەقینەی ئەو کارە هونەرییانەی کە دوای دابڕانێکی زۆر

و دەستپێکردنەوەی لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی ڕابوردوو کاری پێ کرد، ماندوونەناسانە و بێوچان بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی لە مانگی هەشتی 2002 بۆ هەتاهەتایی ماڵئاوایی لێ کردین.

گەرچی زیاتر لە سەدەیەک تێپەڕیبوو بەسەر ئەو شێوازی کارکردنەی ئەم پیادەی دەکرد کە بە ئیمپریسیۆنیزم دەناسرا و سەرەتاکەی لە فەرەنسا و بەتایبەتی لە پاریس لە گەڕەکەکانی مۆنماخت لەسەر دەستی هونەرمەندانی وەک کلۆد مۆنێ و ئێدوار مانێ و بیسارۆ و دواجار سیزان و ڤان گۆگ و گوگان دەستی پێ کرد... ئەوان سروشتیان ڕاستەوخۆ لە دیدە جیاوازە مرۆڤایەتییەکەیانەوە دییەوە، بە شێوازێکی ڕەنگاڵەی چڕ دەیانکێشا و گوزارشتیان لێ دەکرد. وێڕای ئەمانە، کاریان لە بەدۆکومێنتکردنی ئەو ژینگەیە دەکرد کە تیایا ژیابوون، چ لە ناوەوە و چ لە دەرەوەی هەستی خۆیان، ئەوان مەبەستیان شکاندنی ڕێچکەکان بوو تا ئەو کاتە هونەر دوور لە ڕووناکیی ڕاستەقینە و هەوای پاک لە ستۆدیۆدا ئەنجام دەدرا.

هونەرمەند هاوکات وەک شۆڕشگێڕێک لە هەوڵی تێکشکاندن و ڕماندنی پێوەرە باوەکانی هونەردا بووە تا خودی خۆی و چێژ و هەست و نەستی لە سەر ڕووی تابلۆ تۆمار بکات. ئەو هەوڵی ئەوەی دەدا کە ڕاستەوخۆ وێڕای هەستی بینینی، هەستەکانی دیکەشی چالاک بین تا بتوانێ گوزارشت لە کاریگەرییەکانی سەرما و گەرما و بۆن و بەرامی گوڵ و دار و خۆڵ... بکا و ئەمانە گشتیان ببنە هێڵ و ڕەنگ و فۆرمی دڵگیر. ئەوان ڕاستەوخۆ دیمەنی سروشتیان کێشاوە، بەڵام ئەوەی ئەوان دەیانکێشا، جیاواز بوو لەوەی ئەوانەی پێش خۆیان... مامەڵەکردنێک کە لێوانلێو بووە لە هەستی مرۆڤایەتی و پڕ بوە لە گەرمی! وا کاریان دەکرد کە ئەوەی نە تەنها بەر دیدیان دەکەوێت، بەڵکە بەر هەموو هەستەکانی دیکەیان هەر لە بۆن و بیستنەوە تا هەستکردنیان بە سەرما و گەرما و تیشک و تاریکی وەک لە تابلۆی کێڵگەی گوڵەبەڕۆژەکانی ڤان گوگدا دەیبینین!

وێڕای ئەو ئەدا ئیمپریسیۆنیستە و کارکردنی بەو تەکنیکە ئازادە کە کتومت دید و ناوەوەی هونەرمەند خۆی بووە، هونەرمەند ئازاد شەوقی هاتووە مامەڵەیەکی کۆنسێپتئاسای لەگەڵ بابەتی کارکردنەکەی کردووە وەک ئەوەی وێنەگەلێکی ڕەنگینی ئەم سروشتەمان نیشان بدا کە ئەم لە یادەوەرییەکانیدا بە تەڕوبڕی و زیندوویی ئەرشیڤی کردوون و دەیەوێ وەک شاهیدێک سروشتێکمان نیشان بدات کە بەر لە وێرانکاری و ڕاگوێزان و دەربەدەری چۆن سیحرێکی لە جوانی هەڵگرتبوو، دیارە ئەو ساڵانێک وەک چاودێری بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی سلێمانی تا ئەو کاتەی خانەنیشین دەکرێ، بەردەوام لە گەڕاندا بووە لە دێیەکەوە بۆ دێیەکی کە، لە ناوچەیەکەوە بۆ ئەوی دی، لە باکوورەوە تا باشووری نیشتیمان..

ئەو کەسەر و نەهامەتی و وێرانییە دەبایە لای هونەرمەندێکی هەستناسک و مرۆڤێکی هێند عاشق بە میللەتەکەی و دەروێشی سروشتەکەی کە لەگەڵ کێشانی هەر تابلۆیەکیدا ڕووناکیی بیرەوەرییەکانی لە نەستیدا هەڵکات و ئەوانی دیکە خامۆش و عارفانە جەزبە بگرێ. هەر بۆیە کاتێ کە سەیری کارە هونەرییەکانی دەکەین، ئەوسا دەبینین چ کارگەیەکی بەرهەمهێنانی ڕەنگ لە نەستی ئەم هونەرمەندەدا ڕۆژانە دڵگیرترین ڕەنگەکانی ناو سروشتی ئێمە بەرهەم

ئازاد شەوقی

دێنێت، بۆیە سروشتە ڕەنگینەکە دەکاتە نوێنەری گەیاندنی ئەو هەستە ڕەنگاڵەیەی کە ئەم دەیەوێ لە جوانترین دیمەندا بینەخشێنێ. ئەوەی کە لای ئەمیش دواجار ئەرشیڤ دەکرا، ناوی دێ و شارۆچکەکان بووە کە مێژوویەک پێشتر ئەم وەک سەرپەرشتیار کاری تیا کردووە، بۆیە عەشقەکەی ئەم بۆ نیشتمان و جوانییەکەی وەفایەکە کە خۆلێدەربازکردنی سەختە، ئەو لە دانیشتەکانیشدا بە و زمانە وەسفئاسایەی گۆرانی شاعیر باسی لەو سروشت و سیما ڕەنگییەی دەکرد لە فەسڵە جیاکانی ساڵ و هەموو ئەو وردەکارییانەی کە لە ناو سروشتەکەدا بەدی کراون و جەختی لە جیاوازییەکانی و تایبەتمەندییەکانی لە شوێنێکەوە بۆ جێیەکی دیکە دەکرد. ئەو تەنانەت چیرۆک و یادەوەریی خەڵکەکانیشی لای خۆی ئەرشیڤ کردبوو و بە عەشقەوە دەیگێڕانەوە. من بۆ خۆم هیوای ئەوەم دەخواست کە ئەم هەندێ جار لەو فۆرمە هونەرییە دەربچێ و هەستەکانی بکاتە تێکست و نووسین جا یان گێڕانەوە بێت یان چیرۆک یان هۆنراوە، چونکە وەک ئاشکرایە، ئەو ڕێچکەیەی گۆرانی شاعیر لە تازەگەریی شیعردا گرتی، کەم هەبوو ئەو جێپێیە هەڵگرن.

ئازاد شەوقی یەکێک بووە لە و ڕۆشنبیرە چالاکانەی کە بە تەنها هونەرەکەی نەخوێنراوەتەوە بەڵکە ئەو خاوەنی کۆمەڵێ لایەنی دیکەی گرنگ بووە کە گرنگییەکەی گەر زیاتر نەبووبێ لە هونەرەکەی، کەمتر نەوبوە، ئەویش کارەکەی بووە وەک مامۆستایەک کە لێپرسراوێتیی پەروەردەیی لە ئەستۆدایە بۆ برەودان بە هونەرێک کە هێند نابێ هەنگاو دەنێ بۆ دروستبوون لە ڕێگەی دروستکردن و پەروەردەکردنی کادێری فێرکردن و گشتگیرکردنی وێنە وەک وانەیەک کە لە هەموو پلەکانی خوێندندا دابنرێ و چاودێریی شێوازی ئەنجامدانەکەی بکرێ، کە دیارە ئەو بۆ خۆی گرنگییەکەی زانیوە بۆیە لە خوێندنگەکاندا هەوڵی بەمەنهەجکردنی داوە.

لەم پرۆسە گرنگەدا لە دروستکردنی پێگەی وانەیەک لە پاڵ وانەکانی دیکەدا و هاوکات هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی مەنهەجێک بۆ فێربوونی هونەر بۆ گشت قۆناغەکانی فێربوون گەورەترین بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ دەگرێ و هەوڵ دەدات بۆ داهێنانی شێوازێکی دەرسوتنەوەی هونەر لەسەر زەمینەیەکی کوردی کە پێشتر بەردەست نەبووبێ. هاوکات گرنگیدان بە ئەرشیڤ و دروستکردنی مۆزەخانەی فۆلکلۆری و هەروەها هاندان بۆ دروستکردنی گەلێریی هونەری و پشتگیریکردنی ئەوانەی بەم کارە هەڵدەستن، بۆیە ئەم مامۆستایە دەبێت فرەلایەن بخوێنرێتەوە کاتێ کە لەسەر مێژووی هونەری و ڕۆشنبیریی ئەم بدوێین.

سەرقاڵبوونی ئەو بەم لایەنە گرنگەی فێرکردنەوە وا دەکات ماوەیەک زۆر لە کارکردنی هونەری

نیگارکێشان بوەستێ و ئەرشیڤێکی دەوڵەمەندی دیمەنە جوانەکانی کوردستان لە شار و شارۆچکە و لادێکان و چیا و باخ و کێڵگە و گوڵوگوڵزارەکان و خانوبەرە و تەلارسازیی دێ و لادێکان لای خۆی دۆکومێنت بکات و لە داهاتوودا دەبنە کەرەسەی سەرەکیی بابەتی کارکردنە هونەرییەکەی کە ئەویش سەرلەنوێ دروستکردنەوەی بووە بە شێوازێکی ڕەنگین و دڵڕفێن لە سەر ڕووی تابلۆ دوای وێرانکردن و ڕوخاندنی سەرلەبەری ئەو بەهەشتە کە لەسەر دەستی ڕژێمی وێرانکاری بەسەرچوو ئەنجام درا.

لەو ڕوانگەیەی کە هونەرمەند وەک تاکێکی کارا و چالاکی ناو کۆمەڵگەکەی کە دەیەوێ نەک بە تەنها هونەرەکەی لە سەردەمانێکدا کە هونەر بۆ خۆی پێگەیەکی لاوازی هەبووە، بەڵکە وەک قەبارەیەکی مەعریفی بە بەرگێکی ئەکادیمی بپۆشرێت و مامەڵەیەکی زانستییانەی پێ بکرێ، چونکە وەک ئاشکرایە، ئازاد شەوقی لەگەڵ هاوەڵەکانیدا مامۆستایان ( قادر کوردی و خالید سەعید) لە پێشەنگی ئەو هونەرمەندانە بوون کە دەرچووی ئەکادیمیای هونەریی بەغدا بوون و بۆ یەکەمین جار لە کوردستاندا فێربوونی هونەر و پێویستیی هونەریان بە شێوازێکی زانستی و ئەکادیمی پیادە کرد. ئەو دەیویست وەک هونەرمەندێک کارایانە لە ناو پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و پەروەردەیی و لایەنە فەرهەنگییەکانی دیکەدا بوون و ئامادەگیی خۆی بسەلمێنێ و ڕۆڵی خۆی بگێڕێ و جێدەستی دیار بێ، هەوڵدان بۆ دانانی سیستەمێکی پەروەردەیی بۆ خوێندنگە و دامەزراوە هونەرییەکان، کارکردن بۆ دروستکردنی مۆزەخانەیەکی فۆلکلۆری کوردی بۆ ئەرشیڤکردنی کەلەپوری نەتەوایەتیمان و هاوکات کارکردنی لە ناو کایەکانی دیکەی هونەر وەک شانۆ و تیپە موزیکییەکان، هەروەها بەوە ناوەستێتەوە و دەکەوێتە کارکردن لە ناو ڕیزەکانی خەباتی سیاسیدا و چەندین جار دووچاری گرتن و دوورخستنەوە دەبێت.

ئەو وەک گەورەترین برا لە خێزانێکی گەورەی پانزە نەفەریدا کاریگەریی گەورەی دەبێ لە دروستکردنی ژینگەیەکی هونەریی تەندروست لە ناو خێزاندا کەوا بکات زۆربەی خوشک و براکانی پەلکێش بکات بۆ ناو دونیا ڕەنگینەکەی خۆی و هەموو بە هونەری نیگارکێشانەوە سەرقاڵ بن و هەریەکە و لە شوێنی خۆیدا خزمەتێ بگەیەنێت کە زیاد لە هەشت کەس لە ئەندامانی خێزانەکەی چ وەک مامۆستا و چ وەک هونەرمەند و چ وەک چاودێری هونەر لەو بوارەدا کار بکەن.

وێڕای ئەم هەموو بەخشندەییە کە خۆی لە مێژوویەک چالاکی و پڕکردنەوەی کەلێنێکی مەعریفی لە مێژووی ڕۆشنبیری میللەتێک دەبینێتەوە، پێویستە ئاماژە بە دیوێکی گرنگی ئەم پرۆسەیە بکرێ، ئەویش پەلکێشکردنی هاوسەرەکەیەتی بە شێوەیەکی زۆر خۆڕسکانە بۆ ناو ئەو دونیا ڕەنگاڵەی، ئەم ڕاستییەش جێگەی داخە کە مێژوو لێی بێئاگایە و هیچ لایەکی لێ ناکاتەوە، ئەویش دەبێتە قوربانیی کۆمەڵگەیەکی پیاوسالار کە چارەنووسی هاوڕەگەزەکانیشی وەها بێت کە تەواوی چالاکییەکانیان بە هەند وەرنەگیرێن و فەرامۆش دەکرێن گەر هاوسەری پیاوێکی ڕۆشنبیریش بێت!

براژنم خاتوو (مەقبولە سەراف) وەک زۆربەی ژنی کۆمەڵگەکەم هەردەم لە خزمەتی هاوسەرەکەیدا بووە، تەنانەت لە پرۆسەی ئەنجامدانی کاری هونەرییشدا بە ئامادەکردنی ڕەنگ و فڵچە خستنەبەردەست و دواجار کۆکردنەوە و

ئازاد شەوقی

پاککردنەوە و دانانی پارلێت لە بەردەمیدا، دوای ئەنجامدانی هەر کارێکی هونەریی ئەو، ئەمیش دادەنیشێت و لە بەرماوەی ڕەنگە هەڵڕێژراوەکانی سەر ڕووی پارلێتەکە کارێکی هونەری بۆ خۆی ئەنجام دەدات، بۆیە ڕۆژانە هاوکات بە شێوە و کۆنسێپتی جیاواز، ئەمیان سەرقاڵی کێشانی دیمەنی سروشتە ڕەنگینەکەی کوردستان بووە و ئەویشیان وردەکاریی ناو سروشتەکە کە خۆی تەنها و تەنها لە چەپکە گوڵدا دەبینییەوە، گوڵ لە هەموو شێوە و جۆرەکانی، بە سەلیقەیەکی وەها کە جۆرەکانی بناسرێنەوە و تا ئێستاش تەواوی ئەو کارانە لە ئەرشیڤی خێزاندا بەبێ دەستکاری ماونەتەوە، گەرچی زۆربەی زۆری کارە هونەرییەکانی ئازاد شەوقی ئەرشیڤ نەکراون و بە شێوەی جیاجیا لە دەست دراوە، فرۆشراون، بە دیاری دراون یان لە قەیرانەکاندا لەناو چوون.. بەڵام ئەرشیڤەکەی براژنم هەروا ماوەتەوە و تەنها یەک جار نمایش کراوە.

تا سەرەتای سەدەی بیستیش ئەم دیاردەیە لە ڕۆژئاوا بەردەست بووە کە چۆن هاوسەرە پیاوەکان تواناکانی خۆیان بەسەر ژنەکانیاندا سەپاندووە، ئەمە تەنانەت لە سنووری خێزانە پێشکەوتنخوازەکانیشدا پیادە کراوە، وەک چۆن لای هونەرمەندانی ئەبستراکتی فەڕەنسی ڕۆبێرت بیلۆنی و سۆنیا دیلۆنیی هاوسەری بینراوە، نەک بە تەنها مێژوو زۆر بە کەمی لا لە سۆنیا دەکاتەوە و تواناکانی فەرامۆش دەکات کە زۆر جار لە مێردەکەی باشتر کاری کردووە، تەنانەت هاوسەرەکانیش ئەمانیان بەکار هێناوە تا لە خزمەتی ناو و ناوبانگی خۆیاندا بن، وەک دەڵێن، هەندێ جار کارەکانی ئەوانیان بە ناوی خۆیانەوە نمایش کردووە، ئەمەش جەخت لەوە دەکاتەوە کە هونەر لە کۆمەڵگەی داخراودا هەردەم لەسەر حسابی پێشێلکردنی مافی ڕەگەزی مێینەی بەرامبەر و بەهەندوەرنەگرتنی تواناکانیان بووە.

## گفتوگۆی ئازاد عەبدولواحید لەگەڵ ئازاد شەوقی:

# شانازییە بۆ من وێنەکێشی خاکی کوردستان بم

ئازاد مەحمود شەوقی هونەرمەندێکی شێوەکاری پێشەنگ و ناسراوی گەلەکەمانە. لە بنەماڵەیەکی هونەرییە، باوکی "مەحمود شەوقی" و هەموو براکانی لە بواری هونەری شێوەکاریدا کاریان کردووە. ساڵی ١٩٢٩ چاوی بە ژیان هەڵهێناوە. لە ساڵانی ١٩٤٧-١٩٤٨ەوە بەشداریی لە بزووتنەوەی شێوەکاریی کوردیدا کردووە، ساڵی ١٩٤٨ لەگەڵ سێ هونەرمەندی عێراقی لە شاری کەرکوک پێشانگەیەکی شێوەکاریی هاوبەشیان کردووەتەوە کە (د. سینان سەعید، مەحمود عوبێدی، سدیق ئەحمەد) بوون. هونەرمەند ئازاد شەوقی یەکێکە لەوانەی لەگەڵ سەرەتای دامەزراندنی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان لە عێراق، لە بەشی شێوەکاری، بە شێوەیەکی ئەکادیمییانە دەستی کرد خوێندن و پەیمانگەی تەواو کرد، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٥دا لە پەیمانگە دەرچوو. لە شاری سلێمانی لەگەڵ هونەرمەندانی تری کورد خزمەتی هاوبەشی کردووە و بەشداریی کردووە.

ئەم هونەرمەندە وەک مامۆستایەک ڕۆڵێکی بەرچاو و کاریگەری هەبووە لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی هونەری و پێگەیاندنی وەچەیەکی هونەریی ڕاپەڕیو، جگە لەوەی دەستپێشخەریی کردووە لە دامەزراندنی مۆزەخانە و بێوچان هەوڵی داوە پەیمانگەیەکی هونەرە جوانەکان بۆ کورد بکرێتەوە، ئەوە بوو لە پێش ڕاپەڕین بە چەند ساڵێک ئەو ئاواتەی هاتە دی و لە شاری سلێمانیدا پەیمانگەی هونەرە جوانەکان دامەزرا و لەو پەیمانگەیەدا کۆمەڵێک لە قوتابیانی کورد لە بوارە جیاجیاکانی هونەری مۆسیقا، شانۆ و شێوەکاری پەروەردە کران. لەم دواییەدا چاومان پێی کەوت و لە دەمەتەقێیەکدا لەگەڵی کەوتینە لێدوان لەبارەی پرۆژە هونەرییەکانی، هۆی وەستاندنی چالاکییەکانی خۆی و بیروڕای تایبەتی بەرامبەر بە بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان.

**ڕامان: وەک هونەرمەندێکی کورد کە لە بواری هونەری شێوەکاریدا کار دەکەیت، باسی ئەو سەردەمەمان بۆ بکە کە تێیدا دەستت داوەتە کاری هونەری. ئەو هونەرمەندانەی پێش تۆ لە شاری سلێمانی یان لە شاری کەرکوک کاریان کردووە، کێ بوون؟ کاریگەرییان بەسەرتانەوە تا چ ئاستێک بووە؟**

ئازاد شەوقی: من وەک موعەلیمێک و وەک ئینسانێک کە شانازی بە پیشەکەمەوە دەکەم، لەسەر بەشێک لە بەشەکانی جوانیی ژیان و خۆشەویستی بە هەموو مانای وشەوە، وەک بچووکێک و خزمەتکارێک، لە ماڵەوە شەرەفی ئەوەم بەرکەوت کە بتوانم ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەم بوارە لە خۆمدا پەرە پێبدەم.

ئێمە لە بنەماڵەیەکی خوێندەوارین، باوکم تەئسیرێکی باشی لەسەرم هەبوو، بەڵام من لە پێش چلەکانەوە و لە چلەکانیشدا (١٩٤٦-١٩٤٨) بە تەواوی خۆم بۆ بەشی شێوەکاری تەرخان نەکردبوو، بگرە ژیانی کۆمەڵایەتیم لە چەند ڕۆژنامەیەکی ناسراوی عێراقدا وەک (ئەلوەتەن) و (ئەساس) و هەندێکی تر کە لە دوای جەنگی جیهانی دووەم دەردەچوون دەست پێ دەکات، کە برای خۆشەویستم د. مارف خەزنەدار ئاگای لەو نووسینانەم هەیە و زیاتر ئەو تەشویقی دەکردم، چونکە ئەو کاتە ئەو لە بواری نووسیندا باڵادەست بوو. بەڵام هەموو ئینسانێک دەبێ خۆی ڕێڕەوی ژیانی خۆی دەستنیشان بکات. ئەوە بوو هەلم بۆ ڕەخسا و ساڵی ١٩٥٢ چوومە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا، بەشی بەیانیان، کە یەکەم پەیمانگەی هونەرە جوانەکانە لە عێراق و بە دەستپێشخەریی هونەرمەندی گەورە، مامۆستایان (فایەق حەسەن، حەقی شیبلی) و نووسەری عێراقی (زەنوون ئەیوب) دامەزرا کە ئەم نووسەرە عەمیدی پەیمانگەکە بوو.

من قەرزاری مامۆستایانی خۆمم کە ئەو بەهرەیەیان تێدا خوڵقاندم هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە، پەیمانگەش ڕێخۆشکەر بوو بۆ من، چونکە یەکەم کورد بووم لە لیوای کەرکوک لەو پەیمانگەیەدا وەرگیرام. پاشان هەندێ کوردی تر بوون بە هاوبەشم کە تا ئێستاش هەر لە ڕێڕەوی جووڵانەوەی شێوەکاریی کوردیدا بەشدارن، لەوانە هونەرمەند (سلێمان شاکر) و هونەرمەند (محەمەد عارف) کە پاشان هاتنە پەیمانگەوە، لە سلێمانیشدا تەنیا کەسێک، هونەرمەندی خوالێخۆشبوو (خالید سەعید) بوو کە هاتە پەیمانگەوە.

من ناتوانم بڵێم پەیمانگە یان ئەکادیمیا کارگەی دروستکردنی هونەرمەندن، دەبێ ئینسان خۆی ڕێڕەوی ژیانی خۆی دەستنیشان بکات، چونکە پەیمانگە و ئەکادیمیا تەنیا ڕێگەخۆشکەرێکن، جێگەی شانازییە بۆ من هونەرمەندی نەمر مامۆستا (جەواد سەلیم) و هونەرمەندان (فایەق حەسەن و عەتا سەبری) و لە ساڵی دووەمیشدا هونەرمەند (ئیسماعیل شێخلی) مامۆستام بوون کە ئێستا تەنیا هونەرمەند (ئیسماعیل شێخلی) ماوە، ئەو مامۆستایانە دۆستی دێرینی میللەتی کورد بوون، بۆیە ئێمە قەت لە بەغدا هەستمان بە غەریبی

نەدەکرد، ئەوەندە مرۆڤدۆست بوون زیاتر لە برا عەرەبەکان بایەخیان بە ئێمە دەدا، تەنانەت هانیان دەداین خوێندنی باڵا لە دەرەوەی عێراق تەواو بکەین، لە پاش تەواوکردنی پەیمانگەش بە نامە هەر هاندەرم بوون، بە ڕاستی هەرگیز ئەو کاتانەم لە بیر ناچێتەوە.

**ڕامان: ئێوە ساڵانێکی دوورودرێژتان لە بواری هونەری شێوەکاریدا بەسەر بردووە، لە پاش ئەو ئەزموونە ئێستا بیستوومانە جەنابتان مانتان لە وێنەکێشان گرتووە، حەز دەکەین باسی هۆی ئەم مانگرتنە بکەیت؟**

ئازاد شەوقی: ئەوە حەقیقەتە... پرسی دەروونی بەشێکیان خەونن و نایەنە دی، من هاوار دەکەمە حزبە کوردستانییەکان، وەک بچووکێک داواتان لێ دەکەم کە دەبێ ئاشتی بەرپا ببێ و ئازادی بە ڕۆشنبیران بدرێ، دەبێ ڕۆشنبیران و هونەرمەندان تەبا بن، نەمامی خۆشەویستی لەم خاکەدا بچێنن، هەر ئەوەشە هەمووومان خەونی پێوە دەبینین.

لە هەموو شوێنێکدا خەڵک خەبات دەکات ئازادی بچەسپێنێت، کوردیش حەز لەوە دەکات ئازادی و ئاشتی بەرپا بن، ئەگەر چەکیشی هەڵگرتبێ، بۆ ئەوە بووە خاکی خۆی بپارێزێ و ئازادی بکات. میللەتی کورد میللەتێکی دڵپاکە، بە مەرحەبایەک زۆر شتی لە بیر دەچێتەوە، جێگەی داخە میللەتی کورد تەبا نەبێ، حەیفە شەڕانی بێ یان بکوژرێ.

**ڕامان: پێت وایە مانگرتنەکەی جەنابت هیچ کاریگەرییەکی هەبووبێ و دەنگ و سەدایەکی وای هەبووبێ شایەنی باس بێت؟**

ئازاد شەوقی: وا بزانم دەنگی حەقیقەت لە لای زۆر کەس ڕێزی خۆی هەیە، بەڵام چۆن ئەو دەنگە جێگەی خۆی دەکاتەوە، بێگومان کات و کۆششی دەوێ. ئەگەر پەرلەمان بکەوێتەوە گەڕ، لەوێ لیژنەی ڕۆشنبیری هەیە، ئەو کاتە حکومەت دەبێ دەستووری هەبێ و مافی ئازادی بە ڕۆشنبیران و هونەرمەندان بدات، لە پاڵ مندا کۆمەڵێک دەنگ هەن کە هەمان بۆچوونی منیان هەیە یان لەوانەیە پشتگیریم لێ بکەن و بڵێن هەقتە، براکوژی دەبێ ڕاوەستێ و پەرلەمان بکەوێتەوە گەڕ، هەقە میللەتی کورد بناسرێ، کە میللەتی کورد لە ڕێگەی ڕۆشنبیرییەوە دەناسرێ، کەچی ڕۆشنبیری و کولتووری ئێمە ماوەیەکی دوورودرێژە بە شەڕەوە خەریکە، بە ژیانێکی ئاڵۆزەوە خەریکە کە ئاشکرایە ئەمە چ زیانێکی گەورەی هەیە.

ڕاستە ئێستا مانم گرتووە، بەڵام بەو هیوایەم بە هەوڵی خێرخوازان ئاشتی بچەسپێت. ئێستا کە مانم گرتووە، خۆم بە نیمچەمردوویەک دەزانم. من لە ساڵی ١٩٤٢ەوە لە تابلۆکێشان نەوەستاوم، دێ بە دێ لە کوردستان گەڕاوم و وێنەم کێشاوە، ئینشائەڵڵا ئەو شانازییەم پێ دەبەخشرێ کە وێنەکێشی خاکی کورستان بم.

**ڕامان: جەنابتان لە لیژنەی ڕۆشنبیرانی بێلایەن بوون و کۆششتان بۆ ئاشتی دەکرد، بەڵام لە پاشاندا لەگەڵ نووسەرێک دەستتان لەو لیژنەیە کێشایەوە. دەکرێ بزانین هۆی چییە؟**

ئازاد شەوقی: ئەم لیژنەیە بە ڕێکەوت دروست بوو، من ئینسانێکی بێلایەنم، هونەرمەندم، سیاسی نیم، وتیان هەندێ کەسی بێلایەن کە گوێیان لێ بگیرێ، بێن و بخرێنە بەینی هەردوولاوە، لیژنەکەشیان ناو نا لیژنەی ڕۆشنبیرانی بێلایەن. لیژنەکە لە ماوەیەکی کورتدا چالاکیی زۆر بچووکی نیشان دا، بەڵام بەرنامەیەکمان دانا تا

ئازاد شەوقی

کۆبوونەوەی لەسەر بکرێت. هەندێک لەو حزبانەی سەرپەرشتیی ئەو لیژنەیەیان دەکرد، زۆر شتیان دەکرد کە بەشێک لە ئێمە هەر ئاگامان لێ نەبوو، کە ئەویش زۆر لەسەر کەسانی بێلایەن دەوەستێ، بە داخەوە چالاکییەکانمان بە ئەنجام نەگەیشت، من ویستم وەک وێنەکێشێک دەورێکی گەورە ببینم لە جێگیرکردنی ئاشتیدا، چونکە نەک ئێستا، بگرە هەر لە ساڵی ١٩٥٨ەوە من لەگەڵ ڕێبازی ئاشتیی عێراقدا وەک بێلایەنێک کار دەکەم، وشەی ئاشتیم زۆر لا جوانە، چونکە بەبێ ئاشتی هیچ شتێک نابێ، نە ژیان و نە ڕۆشنبیری نابن، ئەگەر ڕۆشنبیری نەما، تۆ ناتوانی لەگەڵ میللەتدا بدوێیت، چونکە هەر ئاشتییە کە شارستانییەت دروست دەکات و قەڵەم پەروەردە دەکات. بە ئاشتی، ئینسان جوان دەبێ و خۆشەویستی زیاتر دەچەسپێ، بۆیە من هاوارم بردە بەر دۆستێکی ڕۆشنبیری خۆم کە زۆر بەتەنگ هەستی منەوەیە، بۆیە پێکەوە دەستمان لەو کارە کێشایەوە، چونکە بەرهەممان نەبوو و نەماندەتوانی هیچ بکەین.

**ڕامان: ئێستا وەک هونەرمەندێک دوورەپەرێز دێنە بەرچاو، لەگەڵ کۆڕ و کۆبوونەوەی هونەرمەندان کەمتر تێکەڵاویت، ئایا هۆیەکەی شەخسییە، یان هەر لە سەرەتاوە وا بوویت یان بارودۆخێکی تایبەتی دروستی کردووە؟**

ئازاد شەوقی: هونەرمەند کەسێکە ناتوانێ دوورەپەرێز بێ. ئێمە ناڵێین حزبەکانی کوردستان سەرپەرشتیی کولتوور و ڕۆشنبیریی کورد نەکەن، بە داخەوە حزبەکان بەشێکی زۆری تەئسیراتی هونەرمەندانیان قۆستەوە، من دەڵێم لە سیاسەتدا سازشکردن هەیە، بەڵام لە ڕۆشنبیریدا هەرگیز سازشکردن نییە، ئێستا ناتەبایی هەیە، کە هەر ئەو ناتەباییەیە ئێمە لە کار دوادەخات، لە کاتێکدا لە هونەردا هەر ئیشەکە قسە دەکات، بەڵام تەئسیراتی حزبەکان کارێکی وای کرد کە ئێمە بخرێینە ناو گێژاوەوە، چونکە حزبەکان زۆربەی هونەرمەندەکانیان کڕی، مەسەلەکە لێرەدا هەر پارە نییە، لەوانەیە هەندێکیان بە عاتیفە ڕایان کێشابن.

لە ڕاستیدا ڕۆشنبیری دەنگێکە نابێ تەئسیری لێ بکرێ، ئەگەر حزبەکان بە خۆیاندا بچنەوە، دەبێ زەمینە بۆ ڕۆشنبیران و هونەرمەندان خۆش بکەن و ئازادییان بدەنێ و هەلومەرجی گونجاویان بۆ برەخسێنن و کەرەستەیان بخەنە بەردەست، هەرچەندە لێرەدا بەرهەمەکە بۆ میللەتە، لەو حاڵەتەشدا حزبەکان دەبێ لەسەر شتە جوانەکان و کارە چاکەکان مونافەسەی یەکتر بکەن.

**ڕامان: حکومەتی هەرێمی کوردستانیش نەیتوانی لە مەسەلەی پەرەپێدانی هونەر و ڕۆشنبیریدا فەرمانڕەوایەتیی خۆی بکات ؟**

ئازاد شەوقی: دیسان دووپاتی دەکەمەوە کە حزبایەتی وەک خەلەلێک چووە ناو دەزگاکانی دەوڵەتەوە، لەبەر ئەوە هەر بەڕێوەبەرێکی گشتی و هەر وەزیرێک بیری لە خۆی و لە دەوروبەر و تاقمەکەی خۆی دەکردەوە، لەبەر ئەوەی جیهازی ڕاگەیاندن بڕیاری بە دەستە، بۆیە گلەییەکی زۆرم لە وەزارەتی ڕۆشنبیریی کابینەی یەکەم هەیە، بەتایبەتیش کابینەی یەکەم کە دەیتوانی لەسەر بڕیاری وەزیر کۆمەڵێک یاسا و پرۆژەی جوان بخاتە بەردەمی پەرلەمان، کە پەرلەمانیش پاش خوێندنەوەی پەسەندی دەکرد و وەزیر جێبەجێی دەکرد، بە ڕاستی هیچ بڕیارێکیان دەرنەدەکرد خزمەتی هونەرمەندان و ڕۆژنامەنووسی بکات.

ئازاد شەوقی

**ڕامان: بیروڕایەک هەیە دەڵێ هونەر بەتایبەتی و داهێنانی کوردی بە گشتی، لە پێش ڕاپەڕین چالاکتر بوو وەک دوای ڕاپەڕین، تۆ هەست ناکەیت ئەو کەفوکوڵەی جاران نەمابێ، ئایا هۆیەکەی چییە؟**

ئازاد شەوقی: پێش ڕاپەڕین دوژمن لە ناوماندا دەژیا و موعاناتەکەمان زۆر قورس بوو، ئەوەندەی ئاگامان لێ بێت، بەتایبەتی لە سلێمانی، ڕۆشنبیران دەستیان خستبووە ملی یەکتر و هیچ کەلێنێکی وا گەورە نەبوو دوژمن کنەی تێدا بکات. دەبوو لە پاش ڕاپەڕین ئەو تەبایی و یەکگرتنە دووقات بوایە، بەڵام ئێستا هونەرمەندان بوونەتە گرووپی جیاجیا. نەمانی یەکێتیی فکر و دۆستایەتیی نێوان ڕۆشنبیران و هونەرمەندان بۆ چارەسەری کێشەکان بەدی ناکرێ، چونکە هەندێ لەوانە لاواز و هەلپەرستن، دووڕوو و پارەپەرەستن، ئەو مەراییکەرانە ئامادەن بچنە هەموو بوارێک. بە داخەوە، زەمینە بۆ ئەوانە خۆش کرا، هاتە سەر ئەوەی بڕیاربەدەستیش بن، ئەمەش بووە هۆی دابڕانی نێوان هونەرمەندان کە پێشتر ئەوە زۆر کەم بوو. پێشتر هونەرمەندان خواخوایان بوو پێشانگەیەک هەبێ و تێیدا سەرکەوتوو بن، هەرچەندە دوژمنیش لە ناویاندا بوون، ئەوساکە پێکەوە دادەنیشتن. ئێستاکە دوژمن ڕۆیشتووە، گیروگرفت ئەوەیە هونەرمەندان و ڕۆشنبیران دانوویان پێکەوە ناکوڵێ، ڕۆشنبیر جنێو بە یەکتری دەدەن، ئەوە لە کاتێکدا ڕۆشنبیر زمانی خۆی هەیە، زمانی برایەتیی هەیە، بۆ دانانیشن بیروڕای ئازاد لەگەڵ یەکتر ئاڵوگۆڕ بکەن، ئەمەش گەورەترین کارەساتە کە ڕۆشنبیران یەکتر نەدوێنن و یەکتریان خۆش نەوێ.

ڕۆشنبیران لایەنێکی کاریگەرن لە ژیانی میللەتدا، وەک دەڵێن، ئاوێنەی کۆمەڵن. بە داخەوە ئێمە لە ئاوێنەیەکی شکاودا خۆمان دەبینین، لەو حاڵەتەشدا ئینسان لە ئاوێنەی شکاودا شێواو دەردەکەوێ، کە دەتوانین ئاشتی و خۆشەویستی و ڕێزلێنان لە یەکتر بکەینە بنچینە، زمانی دەمەتەقێ پێڕەو بکەین، ئێمە زمانی حیوارمان نییە، بۆیە یەکتر ناناسین، کەچی جنێو بە یەکتر دەدەین.

**ڕامان: وەک هونەرمەندێکی خاوەن ئەزموون کە سەردانی پێشانگەکان دەکەیت، سەرنج و ڕەخنەت لا دروست دەبێ، بۆچی وەک هونەرمەندە عێراقییەکان (شاکر حەسەن ئال سەعید و نوری ڕاوی) هەوڵت نەداوە نووسینت لەو بوارەدا هەبێ؟ یان بۆچی لە بواری ڕەخنەی تەشکیلیدا بەشداریت نییە؟**

ئازاد شەوقی: من وەک وێنەکێشێک، ناتوانم بڵێم وەک هونەرمەندێک، چاوەڕێی ئەو پاداشتەم کە میللەت دەمداتێ، کە ئەو خەڵاتەم هەڵگرت کە بڵێن تۆ هونەرمەندی، ئەوسا لە هەموو دانیشتنێکدا ئەو خەڵاتە دەکەمە ملم و پیشانی میللەتەکەمی دەدەم، بەڵام من وەک وێنەکێشێکی ئارەزوومەند تا ئەم لەحزەیە لە مەسەلەی ڕەخنە غافڵ نەبووم، هەرچەندە بواری ڕەخنە لە بەغدا زیاترە، لەبەر ئەوەی گۆڤاری پسپۆڕیان هەیە کە چالاکانە بەرهەم بڵاو دەکەنەوە. من حەز دەکەم لە وڵاتی خۆم لەسەر هونەرمەندەکان بدوێم، بەڵام ڕۆژنامەکان زۆربەیان هیی حزبەکانن، زۆر جار دەڵێن درێژ دەنووسیت، ئێ خۆ ڕەخنە (فاکس) نییە، بروسکە نییە. ئەگەر بیروڕای خۆت نیشانی جەماوەر بدەیت، لەوانەیە لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەیەک پڕ بکەیتەوە. نووسین وەک وێنەکێشان نییە، تەجریدی بکەیت یان بیکەیت بە سوریالی یان بە دوو فڵچە و ڕەنگ کۆتایی پێ بهێنی، هەرچەندە سوریالیزم حەقیقەتێکی گەورەیە و هونەرێکی بەرزە کە بڕوام پێیەتی، یان تەجرید کە هونەرێکی بەرزە، بەڵام نەک بۆ ئێرە کە زۆر کەس دەیکەن، بۆیە بوارت نادەن ڕەخنە بنووسی.

من زۆر جار هونەرمەندان ڕووم تێدەکەن و دەڵێن حەز دەکەین بیروڕات بزانین، منیش زۆر جار حەز دەکەم لەسەر هەندێ پێشانگە بنووسم، بەڵام بوار نییە.

**ڕامان: وەک پرۆژەی نووسین دەتوانی ئەو نووسینانە لە دوو توێی کتێب بڵاو بکەیتەوە؟**

ئازاد شەوقی: من لە ساڵی ١٩٤٢ەوە ئەرشیڤم هەیە لەسەر هونەری تەشکیلیی کورد، کۆمەڵێ مامۆستا هەن کە خۆم بە قەرزاریان دەزانم، لەوانە مامۆستا گۆرانی شاعیر کە لە هەولێر دراوسێم بوو، ئەو کاتە دەستی لە کار کێشابووەوە.

**ڕامان: ئێوە لەگەڵ ١٠ هونەرمەندی تردا سەردانی پاریستان کرد، نیاز لە سەفەرەکە ئەوە بوو هونەری کوردی بە دەرەوەی کوردستان بناسێنن؟ بە ڕای ئێوە، تا چ ڕادەیەک توانیوتانە بەو تابلۆیانە هونەری کوردی بناسێنن؟**

ئازاد شەوقی: کە باسی چوونە پاریس دەکرێ، وەزعم تێک دەچێ، من پاریسم نەدی، ٨-٩ ڕۆژێک لەوێ بووین، من لۆڤەرم نەدی، تا ببم بە حاجیی هونەر، واتە بچمە پاریس و لۆڤەر نەبینم، واتە هیچم نەدیوە. کە ڕۆیشتین، کاک مەسعود بارزانی و مام جەلال و کاک جەوهەر نامیق سالمی سەرۆکی پەرلەمان قسەی جوانیان بۆ کردین، پێیان وتین ئێوە دەچنە دەرەوە، دەبنە باڵوێزێک بۆ گەلەکەتان، دەبێ لە خەڵک بگەیەنن ئێمە کێین، ئەوە بوو هەردوو بەڕێز یارمەتییان داین.

من دەڵێم خۆزگە نەچوومایە بۆ پاریس، بە ڕاستی ناتوانم لە پاریس بدوێم. ئێمە ٨ کەس بووین، بەڵام خۆزیا ١٠٠ کەس دەبووین، چونکە زۆر هونەرمەندی بەتوانا بێبەش بوون. من بە ئامادەبوونی بەڕێز کەندال، سەرۆکی ئینستیوتی کورد لە پاریس، لە بنکەی مافی مرۆڤ وتەیەکم ئاڕاستەی خاتوو دانیال میتەران کرد، لەوێ وتم ئێمە بەشێکی زۆر بچووکین لە خێزانێکی گەورەی ڕۆشنبیری میللەتی کورد، بە ڕێکەوت ئێمە هاتین و داوەتی ئێوە بووین، وتیشم کۆمەڵێکی زۆر گەورەتر بەجێ ماون، خۆزگە ڕێگەیان بۆ دەکرایەوە، کە ئەمانەش لە هەموو بوارەکانی هونەر و نووسیندان، تا بتوانن کولتووری کورد بە پاریس بناسێنن.

## ئازاد شەوقی

ڕامان: جگە لە بواری هونەری، پرۆژەی ترت هەیە بۆ خزمەتکردنی میللەتی کورد، وەک پرۆژەی کوردۆلۆژی، هەروەها پێشنیازت کردبوو بۆ دامەزراندنی پرۆژەیەکی کۆکردنەوەی سامان و کولتووری هونەری کوردی، ئایا ئەو پرۆژانە گەیشتووەتە کوێ؟ ئایا هیچ حزبێکی دەسەڵاتدار بە پیر ئەو پرۆژانەوە هاتووە؟

ئازاد شەوقی: دەڵێن ئەگەر ئینسان لە بواری پسپۆڕیی خۆی کاری نەکرد، ئەوە هەڵەیە، من دوو ساڵە وێنە ناکێشم، بەڵام ئاوڕم لە نووسین داوەتەوە. ئەوانەی خەونن، دەبنە حەقیقەت، لە ڕاستیدا پرۆژەکە یەکەم جار بە ناوی کوردۆلۆژییەوە نەبوو، پێشتر من پرۆژەکەم پێشکەشی پەرلەمان و حکومەت کرد، بەشێک لە ڕۆشنبیران تا ئەم لەحزەیە وەڵامیان نییە، من دوو پرۆژەم هەیە، هیوادارم بە زووترین کات وەڵام وەربگرمەوە، هیچ بەرژەوەندیی منی تێدا نییە، بەرژەوەندیی میللەتە، چونکە پرۆژەی دووەمم کردنەوەی کۆلێجی هونەرە جوانەکانە لە زانکۆکانی کوردستان.

**ڕامان: وەک خاوەن ئەزموونێک لە بواری هونەردا، چ خۆتان، چ خەڵکێکی تر ئایا هەوڵی ئەوەتان داوە کە ئەو ئەرشیڤە کۆ بکەنەوە؟**

ئازاد شەوقی: وەک ئارەزوویەک لە چلەکانەوە زۆر شتم لای خۆم نووسیوە و کۆ کردووەتەوە، ئەگەر بشێ بڵاو بکرێنەوە، دەبێ دەزگایەکی گەورە یارمەتیی لەچاپدانی بدات. من ئەرشیڤێکی دەوڵەمەندم هەیە، بەڵام هیچ لایەنێک یارمەتیی نەداوم، تەنیا حزبی شیوعی کوردستان نەبێ کە پرۆژەی فیلمێکی دوکیۆمێنتیی لەسەر ژیانم بەرهەم هێناوە کە ئەوەش تا ئێستا جێبەجێ نەکراوە، بەهەرحاڵ، سوپاسیان دەکەم.

**ڕامان: جگە لە بواری هونەری شێوەکاری، دەستپێشخەریتان لە بواری تردا هەیە: وەک پرۆژە پێشکەشتان کردووە سەنتەرێکی لێکۆڵینەوەی کولتووری کوردی هەبێ، تا چ رادەیەک بەدەنگتانەوە هاتوون؟**

ئازاد شەوقی: من کە ئێستا کار ناکەم، ناشتوانم بێئیش دابنیشم، بۆیە لەمێژە ئەو پرۆژەیەم لایە، بەشێکیم لە بواری وەزیفیدا ئەنجام داوە، لە بواری دامەزراندنی یەکەم مۆزەخانەی جلوبەرگی کوردیی عێراقی و نەتەوایەتی، لە ڕێی پەیمانگەی هونەرەوە کە لە نێوان دەوڵەتاندا دەبەسترا و وەزارەتی مەعاریفی ئەو کاتە بۆ ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیری گەیاندمیە جیهان. من جلی کوردیم بۆ هەموو دنیا ناردووە، بە هەمان شێوە خەڵکی دەرەوەش بۆیان ناردووم، لە ڕێی وەزارەتی دەرەوە و مەعاریف بە دەستم دەگەیشت، ساڵی ١٩٦٩ کە دیسان ئەو کاتە شەڕ بوو، کوردستانم بەجێ هێشت و چووم بۆ سعودیە. لەوێ بووم بە مامۆستای هونەرە جوانەکان لە جێی مامۆستا (شاکر حسەن ئال سەعید). کە هاتمەوە، ئەو مۆزەخانەیە نەمابوو، جگە لەوە، هەوڵم دا وەک مامۆستایەک کە باوەڕم پێیەتی، برەو بە ڕۆژنامەی قوتابخانەکان بدەم.

**سەرچاوە: ژمارە ٥ی گفتوگۆ، کتێبی گوڵان، ساڵی ١٩٩٧، بە بۆنەی ساڵڕۆژی دەرچوونی گۆڤاری (ڕامان)ەوە بڵاو کراوەتەوە.**

# هونەرمەندی کورد ئازاد شەوقی

**لالە عەبدە**

بۆ یەکەم جار لە تەمەنی 9 یان 10 ساڵیدا، واتە ساڵانی 1956 یا ١٩٥٧ پێشانگەیەکی شێوەکاری لە هۆڵی پەروەردەی سلێمانی کە ئەو کاتە پێیان دەوت مەعاریف و لە ئێستادا بازاڕی کاسۆ مۆڵی پێ دەڵێن کرایەوە. من سەردانی ئەو پێشانگەیەم کرد، یەکەم جار بوو بچمە پێشانگەیەک و تابلۆی هونەرمەندان ببینم و تابلۆکانی هونەرمەندان ئازاد شەوقی، شێرزاد شەوقی، عوسمان خاڵ، خالد سەعید و قادر کوردی و گەلێکی تر کە

# ئازاد شەوقی

ناوەکانیان بە بیرم ناکەونەوە، لەو پێشانگەیەدا نمایش کرابوون.

مامۆستای هونەرمەند ئازاد شەوقی هونەرمەندێکی سروشتپەرستە و خاوەنی کۆمەڵێک ڕەنگە بە شێوەیەکی تەعبیری و جوانکاری و لێکدانەوەیەکی تایبەتی بۆ خۆی دروست کردووە لە ڕووی پالێتی ڕەنگییەوە، بابەتەکانی بریتین لە سروشتەکەی کوردستان، وەک چیا، دۆڵ، لادێ، چنار، بی، دارتوو و هەنار. لە دیدگای ئەم هونەرمەندەوە زەوقی ڕەنگدانان سادەگەرێتیی پێوە دیارە، هەر وەک ئینتیباعیەکان پلە ڕەنگییەکانی پارچەپارچە ڕێک خستووە و خۆی لە شێوەی ئاکادیمی دوور ڕاگرتووە. ڕەنگە گەرم و ساردەکانی زۆر تێکەڵاوی یەک نەکردووە. لە دیدگای ئەم هونەرمەندەوە هێڵی ئاسۆ شاراوەیە وە زۆر مەبەستی نییە زیاتر لەوەی خودی بابەتەکە بە شێوەیەکی سادە فۆرمەکان دەرەخسێنێت، فۆرمە ئاسۆییەکان قوچ دەکاتەوە و لایەنە تەعبیرییەکە لە لای بەرجەستە دەبێت.

کەمێک گرنگیدان بە گۆڕانکاری لەپێناو جوانی و ڕێکخستنی فۆرمەکان وەک سەلیقەیەکی جوانکاری هەموو مەبەستێکی ئازاد شەوقییە و تایبەتمەندییەکی خۆیەتی. ستایلی ئەو دیارە و زوو تابلۆکانی دەناسیتەوە، ستایلێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

بە حوکمی ئەوەی ساڵانێکی زۆر لە وڵات نەبووم و ئاگاداری زۆر لە بەرهەمەکانی نەبووم، بۆیە ناتوانم زۆر دەربارەی ئەو بدوێم.

ئازاد شەوقی لە بواری پەردوەردەکردن و خزمەتی هونەر تەقەلای زۆر داوە وەک مامۆستایەک و چاودێرێک سەرپەرشتی پێشانگەکانی پەروەردەی کردووە. هەر لە ساڵەکانی 1950وە خزمەتی هونەر و پەروەردەی هونەریی کردووە. ئەم هونەرمەندە لە پێشەنگی هونەرمەندانی کوردە.

زۆر لە کارە هونەرییەکانی ون بوون، گۆڕانکاریی ستایلەکانی دیار نییە و زۆر ئاستەمە لێکدانەوەیان بۆ بکەین. لە 1993دا لە فەڕەنسا گەڕامەوە بۆ کوردستان، چەند جارێک یەکترمان بینی، زۆر باسی سروشتی کوردستانی دەکرد و کارەکانی پیشان دام و زۆر بە پەرۆشەوە وەک سەرەتای لاوی باسی هەستیاریی خۆی دەکرد. هونەرمەند ئازاد شەوقی تابلۆکانی زیندوون و شایەنی ئەوەن لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێت.

# ڕەنگێك كە نیشتمان نەبوو... !

## دلاوەر قەرەداغی

بۆ هونەرمەند ئازاد شەوقی

خولیام بوو جارێکی تر بتبینمەوە
جارێکی تر لە ژێر گوێسوانەی ماڵە دوور دوورەکەتا بنیشمەوە
ئەم جارەیان جگە لە شێرزاد*،
ئیسماعیل و تەیرەکانی گوتیان:
"بمانبە! ئەم جارە ئێمەیش دێین... !"
ئەم جارەشیان وەک جارەکانی تر هەر تۆ دەدوێیت و
ئێمەش هەر باڵین و هەر بارانین و هەر بینین!

ئەم جارەشیان هەر تۆ دەڕژێیت و
ئێمەیش وەک گەڕەکێک منداڵی لاسار
لێکدالێکدا بە ژوور و پیپلیکانە و
هەیوان و ژێرزەمین و
سەربان و بانێژە و حەوشە و کەلەبەر و قوژبنی
ئاسمانی تابلۆکانتا

ڕادەکەین و دەنۆڕین و دەفڕین و
پێدەکەنین و دەبارین

بە شێرزاد دەڵێم:
مامۆستا چۆنچۆنی لە زەنگی دەرگاکە بدەین
کە دڵی ئەو ڕەنگە ئازیزە ڕانەچڵەکێ و
لەخۆڕا قەترەیەکی نەپرژێ؟
چما بڵێی ماڵەکەی هێند جێگە و ڕێگەی هەبێ
کە بەش بکا بۆ شاندایانی حوزنی ئێمە و
بۆ قریوەی پێکەنینەکەی تۆ و
بۆ لەباوەشگرتنی فڕینی هەڵفڕین؟

خولیام بوو جارێکی دی بتبینمەوە
ئەی ڕەنگێک هەمیشە ئامێزت واڵا
بتبینمەوە لە شار... لە ژێر هەتاودا
خولیام بوو جارێکی تر
لە قەرەباڵخیی لای سەعات شەش و نیوەکانی
بەردەم کتێبخانەی سلێمانیدا بتبینمەوە
کە دونیا بۆنی ئەڤین و بۆنی چاکانی کاک عومەری شەعب و
بۆنی ڕەنگەکانی جەزا بەکر دەگرێ

خولیام بوو جارێکی تر بتبینمەوە
ئەی قەدیسێک هەمیشە ئامێزت واڵا
بتبینمەوە لە بەر باراندا
بتبینمەوە لە بەیانییەکدا کە هەردووکمان لە پاسێکدا
تۆ تەڕ بە ڕەنگی گەش و من تەڕ بە شیعری شەرمن
لای فولکەی سێوە مزرەکانەوە دادەبەزین و کە دێینە خوار
کیژێک بە لاماندا تێدەپەڕێ و
لە دڵی خۆیدا دەڵێ:
خودایە... چ بوو وا کتوپڕ
سینگم پڕ لە بۆنی بەهەشت بوو؟

خولیام بوو جارێکی دی بتبینمەوە
ئەی ڕەنگێک هەڵکردوو لە شیعری مندا
ئەی خەمێک ڕاکشاو
لە سەر مسۆدەی یەکەمین نامەی دڵداری

ئەی منداڵێک هەمیشە سەرسووڕماو
لەودیو پەنجەرەکانەوە
ئەی پیاوێک هەمیشە ئامێزت واڵا!

من نیگەرانم کە بێمەوە و ببینم لەوێ نیت
بێمەوە و ببینم باوەشێکی ترم لێ کەم بووەتەوە
بێمەوە و ببینم ڕەنگێکی ترم سەفەری کردووە
بێمەوە و ببینم شیعرێکی ترم دیار نەماوە
بێمەوە و ببینم
کۆڵانێکی ترم چووە بۆ پیاسەی دوور

ئەی ڕەنگێک هەمیشە باوەشت واڵا
ئەم جارەش دێین
ئەم جارە جگە لە کاک شێرزاد،
ئیسماعیل و تەیرەکانیشیم لەگەڵ دێن
ئەم جارەیان خەمگینترین لە جاران
ئەم جارەیان دڵمان گەلێک ناسکتر و سەر و ڕیش و باڵمان
شەلاڵترە بە جێگەپێی بەفر و بە جێگەباڵی خەون و
بە جێزامی باران
ئەم جارەیان تووڕەتر و ئارامتر و
قەرەباڵختر و بێدەنگترین لە جاران

لە ترومبێلەکەدا بە شێرزاد دەڵێم:
مامۆستا... با زۆر بە ئەسپایی
وەک نیشتنەوەی پەڕەسێلکەیەک
لە دەرگای ماڵەکەی کاک ئازاد بدەین
ئەو پێدەکەنێ و وەڵامم دەداتەوە:
باشە چاوەکەم... وا دەکەین!

سەرەتای 2003
* مەبەست لە مامۆستا شێرزاد حەسەنە.

**تێبینی: ئەم تێکستە لە کۆشیعری "جادەی مێخەک"ەوە وەرگیراوە.**

# له دەفتەری تێبینیی بینەرانی یەکێك لە پێشانگەکانییەوە:

**مستەفا ساڵح کەریم**

له شاری بەفر و خوێنەوه لەتەک دەستەیەک له هاوڕێیانا بەرەو هۆڵی (ڕەشید) هاتین، بۆ بەشداربوونمان له زەماوەندی هونەری کوردیدا، هاتین: تا سۆراخی ڕاستی بزانین، چونکه دڵنیام که سۆراخی ڕاستی هەر لای ئەدیبی ڕاستگۆ و هونەرمەندی ڕەسەنه. که به ناو تابلۆکاندا گەشتێکی دەرویشانەم کرد، وام هەست دەکرد که دیوانی (گۆران)ی مەزن دەخوێنمەوە، ئەو سروشته جوانەی له شیعرەکانی ئەوا مرۆڤ دەهێنێته جۆش، سەرلەنوێ له تابلۆکانی هونەرمەند ئازاد شەوقیدا جارێکی تر دڵ و هۆش و

دەروون دەگەشێنێتەوە.

پاییز! پاییز!
بووکی پرچ زەرد
من مات، تۆ زیز
هەردوو هاودەرد

***

بەفر ئاسۆی بڵند بگرێتە چوارچێوەی بلوورینی
لە چەم هەڵسێ خوڕە و هاژەی شەپۆلی ئاوی خوێنینی

***

ئەملا یەک پەڵە، ئەولا یەک پەڵە، هەوری ڕەنگاوڕەنگ
لە ناوەڕاستا: بەدەم ئاسۆوە ڕۆژی شۆخوشەنگ

***

پەڕەی هەڵاڵەی چوالەی سووراوڕەنگ
جارجار ئەوەری بە خشەی پێی هەنگ

***

گوڵباخی گەشاوەی گەڵا تێکشکاو
بە کوڵمیا دێتە خوار ئارەق لە گوڵاو

***

جارێکیان لە کۆڕێکی ئەدەبیدا گوتم: "مەگەر بە شیعرەکانی گۆرانا هەندێ شوێنەواری کوردستانمان بناسینەوە". وا ئەم جارەش دەڵێم: تابلۆکانی کاک ئازاد ئەو چاوە گەشانەن کە گوند و دێهاتەکانی کوردستانی پێ دەبینین: هێرۆ، کانی وەتمان، تەوێڵە، بیارە، پێنجوێن، عەسکەر و ئاغجەلەر... ئەم شوێنانە هەرگیز لە یاد ناچن و لەم تابلۆیانەشدا بە نەمری دەمێننەوە. ٣٠ ساڵ پترە کە لە نزیکەوە ئەم هونەرمەندەی هاوڕێم دەناسم، دەزانم چۆن بۆ هونەر دەسووتێ. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ، بەپێی بارودۆخی سەردەم، ئەم جارە لە هەموو جاران زیاتر بەم دیمەنە ڕەنگینە شاد و دڵخۆشی کردم، بەتایبەتی کە پێشانگەکەی هیچ جۆرە دەستیاوێکی تیا نەبوو، بەبێ هیچ پەساپۆرتێ هونەرەکەی چووە دڵی ئەو هەموو خەڵکەوە...

جەماوەر بە گەرمی پێشوازیی لە خۆشەویستیی خاک و نەتەوە کرد بە چیای سەرکەشی و بەفر و بارانی و پاییز و زستان و بەهاریەوە.
ئاوێتەکردنی ئەو ڕەنگانە بەم شێوەیە لە خۆیدا هونەرێکی تایبەتە کە جێگەی ڕێز و پێزانینە. دەستەکانت خۆش. دڵنیاش بە کە هەر ئەم جۆرە کارانە بۆ مرۆڤ دەمێننەوە.

# ئازاد شەوقی: بیرەوەرییە هونەرییەکانم

ناوی تەواوم: ئازاد مەحمود عەبدولقادر شەوقی، بە -ئازاد شەوقی- ناسراوم. لە بەغدا پەیمانگەی هونەرە جوانەکانم تەواو کردووە، خوێندنی سەرەتاییم لە هەولێر و کەرکوک و دیوانیە تەواو کردووە. لە قوتابخانەی (ئیمام قاسم)ی سەرەتایی لە کەرکوک مامۆستا ڕەفیق عالی خوا لێی خۆش بێ کارێکی گرنگی کردە سەر ڕێبازی هونەریم.
لە پشووی هاوینەدا لە نێو کێڵگە و باخ و بێستانەکانی ئیمام قاسمدا چاوم بە دیمەنەکانی دەکرایەوە، هەر لەو ماوەیەدا هونەری بیناسازی سەرنجی ڕادەکێشام، بەتایبەتی خانووە کۆنەکانی کەرکوک و ئەو نەخشونیگارەی لە مزگەوتی (نائب ئۆغلی) و کڵێسەی کلدان لە قەڵای کەرکوک و دەروازەکانی قەڵا و تاقەکانی کۆڵان و مزگەوتەکانیدا بەدیم دەکردن، جگە لە نەخشی سەر کێڵ و مەزاری پیاوچاکان. باوکم کە فەرمانبەری میری بوو، ساڵی ١٩٤٣ لە کەرکوکەوە گوێزرایەوە بۆ دیوانیە و نزیکەی سێ ساڵ لەوێ ماینەوە.
لەم شارە جوانەدا زیاتر شەیدای هونەری تەشکیلی بووم. بەڕێوەبەری قوتابخانە و مامۆستاکانم زۆر هانیان دام و پشتگیرییان کردم، لەوانە مامۆستایان (عەبدولهادی شاکر ئەلعامری، حسێن ئەحمەد ئەلڕەزوی، شیلال فەیاز، عەبدولکەریم خەتلان). لێرە سەرەڕای هونەر، خووم دایە پەخش و بڵاوکراوەی

قوتابخانە و نووسینی وتاری ئەدەبی و خوێندنەوە و لەبەرکردنی دەقەکانی (نهج البلاغة).
لەم قۆناغەدا فەرمانبەری کتێبخانەکەمان زۆر هانی ئەدام و پێی خۆش بوو کە خووم دابووە خوێندنەوە، ڕێنمایی ئەوەی دەکردم کە (موتەنەبی و تەها حسێن و عەقاد و مەحمود تەیمور و ڕەسافی و زەهاوی و عەلی مەحمود تەها ئەلموهەندیس) بخوێنمەوە.
هەر لەم سەردەمەدا چالاکییەکانم فراوانتر بوون، سەرکەوتمە سەر شانۆش، لە دوو شانۆنامەدا بەشداریم کرد، یەکەمیان بە ئینگلیزی (ئاهەنگی چاخواردنەوە) دەرهێنانی مامۆستا (شیلال فەیاز)، دووەمیان (پیسکە) دەرهێنانی (حسێن ئەحمەد ئەلڕەزوی).
وا دێتە یادم سامی عەبدولحەمید کە ئەو ساڵە لە ئامادەیی دیوانیە قوتابی بوو، ئەو میکیاژی کردین. لە ساڵانی دیوانیەمدا زۆر بە تاسەوە بووم بۆ بینینی ئەو شانۆنامانەی لە سەر شانۆی ئامادەیی دیوانیە پێشکەش دەکران.
لە ساڵی ١٩٤٦دا جارێکی تر باوکم گوێزرایەوە بۆ کەرکوک و ئەم شارە بەوەفایەم بەجێ هێشت. لەبەر ئەوەی بە پلەیەکی باش قۆناغی سەرەتاییم تەواو کرد، لە کۆلێژی شا فەیسەڵ لە بەغدا وەرگیرام، بەڵام زۆر زوو بەجێم هێشت، گەڕامەوە ماڵی باوکم لە کەرکوک و لەوێ چوومە قوتابخانەی ناوەندی. لەم دەورەدا هونەرمەندانی شارم ناسی، وەک (مەحمود ئەلعوبەیدی، سینان سەعید، سەدیق ئەحمەد)، لە ئەدیبانیش جووتەبرا (عەبدولسەمەد و عەبدولعەزیز خانەقا و هادی مەردان و ئیبراهیم محەمەد عەلی و نائل یەعقوبی و مارف خەزنەدار)، هەروەها بە دیداری مێژوونووسی مەزن مامۆستا (محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی) شاد بووم.
ساڵی ١٩٥٣ قۆناغی ناوەندییشم تەواو کرد و لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان لە بەغدا وەرگیرام، پێش ئەوەی ئەم شوێنە هەڵبژێرم، زۆر بە تاسەوە ئەمڕوانییە بەرهەمی هونەرمەندەکانی کەرکوک، بەتایبەتی دکتۆر سینان سەعید و هونەرمەندی مەزن مەحمود ئەلعوبەیدی پێشەوای بزووتنەوەی هونەری تەشکیلی لە کەرکوک. بەرهەمە ئەدەبییەکانی چیرۆکنووس عەبدولسەمەد خانەقا و ڕەخنەگر عەبدولعەزیز خانەقا و شاعیر هادی مەردان و وەرگێڕ ئیبراهیم محەمەد عەلیم دەخوێندەوە، لەم قۆناغەشدا ناوبەناو وتاری ئەدەبیم لە پەخش و بڵاوکراوەی قوتابخانە و ڕۆژنامە عێراقییەکاندا بڵاو دەکردەوە. هەر وەک وتم، لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان بەشی بەیانیان وەرگیرام، ئەمە یەکەم ساڵ بوو کە بەشی بەیانیان بکرێتەوە. تەنیا دوو لق بووین، لقی وێنە و پەیکەرتاشی، لقی مۆسیقا.
مامۆستاکانمان (فایەق حەسەن و ئیسماعیل شێخلی و عەتا سەبری و فەرەج عەبۆ) بوون. لەم قۆناغەدا بە هۆی ئەم مامۆستا بەڕێزانەوە زیاتر شارەزاییمان پەیدا کرد و چاکتر لە هونەر تێگەیشتین. پەیوەندیی نێوان بەشی بەیانیان و بەشی ئێواران پتەوتر بوو، شارەزای بەرهەمەکانیان بووین، بەشبەحاڵی خۆم، لەتەک زۆربەی هونەرمەنداندا پەیوەندیم پەیدا کرد، لەوانە مامۆستایان (کازم حەیدەر، جەمال فەرەج، عەبدولغەنی حیکمەت، نوری ئەلراوی، شاکر حەسەن ئال سەعید، مامۆستای مەزن ئەسعەد عەبدولڕزاق، حافز ئەلدروبی، نەزیهە سەلیم، مونیر بەشیر، غانم حەداد، مونیر ئەلحەکیم و ڕوحی ئەلخامش).
لە ساڵانی خوێندنمدا لە پەیمانگە مامۆستای گەورەم هونەرمەندی خوالێخۆشبوو (حەقی ئەلشیبلی) دەورێکی باڵای هەبوو لە ڕێنماییکردن و پێگەیاندنی هەست و هۆشی هونەریمدا. تا ئێستاش بە ڕێزەوە یادی مامۆستاکانم و هاوڕێکانم دەکەمەوە و هەواڵی چالاکییەکانیان دەپرسم.
یەکەم ساڵمان نووسەری بەناوبانگ (زەنون ئەیوب) عەمیدی پەیمانگە بوو، دووەم ساڵ خوالێخۆشبوو (شەریف محەمەد ئەمین حەیدەر) کە کردمی بە چاودێری گشتیی پەیمانگە. بە

ئازاد شەوقی

پلەیەکی باش پەیمانگەم تەواو کرد، نازانم بۆچی زۆر دڵم بەوەوە بوو کە لە بەغدا یان لە دیوانیە دابمەزرێم، چونکە ئەوەی ڕاستی بێت، بە لای خۆمەوە دیوانیە ئەو لانکەیەیە کە تیایدا پەروەردە کرام. هیوام وابوو خوێندنی باڵا تەواو بکەم، بەڵام بۆم نەگونجا. لە قوتابخانەی ناوەندیی سلێمانی کرام بە مامۆستای هونەر و ڕۆژی (١٩٥٥/١١/٢١) دەستم بە کاری خۆم کرد. هەوڵم دا ئەو بناغە هونەرییە زانستییانەی لە لام چەسپیبوون، بیانگەیەنمە قوتابییەکانم. هەر پاش ماوەیەک ئەم هەوڵ و تەقەللایەم کە لەسەر ڕێبازێکی نوێ و نەخشەیەکی زانستییانە بەجێم ئەهێنا، سەریان گرت و بەری ڕەنجەکەم لە پێشانگە هونەرییەکاندا دەرکەوت.

لەو قوتابییانەی ئەو سەردەمە کە شانازییان پێوە دەکەم: (قادر محەمەد سەعید، ڕەئوف عەلی سەعید، تەها خەلیل، عەزیز موراد، فایەق عەلی ڕەشید) بوون. ئەم برایانە هەتا ئێستاش هەڵگری مەشخەڵی هونەرن.

ئینجا بووم بە مامۆستای وێنە لە ئامادەیی سلێمانی، لەو ساڵەدا لەگەڵ هاوڕێی هونەرمەند خالید سەعید کە لە دەورەی خۆم بوو، پێکەوە دیکۆری شانۆنامەی (پیسکەی تەرپیر)مان ئامادە کرد. جگە لەوە، ماکیاجی ئەکتەرەکانیشم دەکرد.

زۆر ئاواتم بوو مەڵبەندێکمان ببێ بۆ یەکخستنی هەوڵ و تەقەللا و چالاکیی هونەرمەندەکان. بەرودوا بەڕێوەبەرەکانی پەروەردەی سلێمانی مامۆستایان (عەزیز محەمەد قادر و ساڵح سەعید و موسا عەبدولسەمەد) زۆر پشتگیرییان کردم. لە ئەنجامدا توانرا (مەڵبەندی هۆی ڕوونکردنەوەی بیستن و بینین) بکرێتەوە. ئەو کاتە لێپرسراوانی وەزارەتی پەروەردە لە کردنەوەی ئەو مەڵبەندەدا زۆر پشتگیرییان کردم. لە سلێمانی نەک هەر پشتگیریم کرا، بەڵکو لە لایەن ڕووناکبیرانەوە پێشوازییەکی چاکیشم لێ کرا، لەوانە خوالێخۆشبوو ئەدیب و نووسەر (مەحمود ئەحمەد)، هاوڕێ و برا کاک (مەحمود تۆفیق خەزنەدار)، برادەری چیرۆکنووس (مستەفا ساڵح کەریم).

ئەم مەڵبەندە لە لایەن وەزیری پەروەردەی ئەوساوە مامۆستا (عەبدولحەمید کازم) کرایەوە، ڕۆژی ١٩٥٨/٣/٢١ بە فەرمانی (٢٨١٦) کرام بە لێپرسراوی مەڵبەند، هەستم دەکرد مامۆستایان و بەڕێوەبەرەکانی قوتابخانەکان زۆر بە خۆشییەوە هاریکاریم لەتەکدا دەکەن.

لەبەر ئەوەی دەورەیەکی تایبەتم لە بەغدا بینیبوو، بۆیە توانای بەکارهێنانی ئامێری سینەما و پرۆژێکتەر و ئامێرەکانی فێرکردنم هەبوو، توانیمان کامێرای وێنەگرتن و کامێرای سینەمایی و جیهازی چاپکردن بە ئاوریشم و ئامێری تۆمارکردنی دەنگ بۆ مەڵبەندە پەیدا بکەین.

ئینجا پێویست بوو کادر بۆ مەڵبەندەکە دابمەزرێ، ئەوە بوو کارەباییەک و وێنەگرێک و چەند وێنەکێشێک لە مەڵبەند دامەزران. ئەم مەڵبەندە بەو توانا کەمەیەوە توانیی خزمەتێکی زۆری دەزگا زانیارییەکان بکات، دەتوانم بڵێم یەکەم مەڵبەند بوو لە هەموو پارێزگاکانی عێراقدا، تەنیا لە وەزارەتی پەروەردە لە بەغدا مەڵبەندێکی لەم شێوەیە هەبوو.

لەو کاتەدا کە سەرپەرشتیاری مەڵبەندەکە بووم، ئەم برایانە لەتەکمدا کاریان دەکرد: مامۆستایانی خوالێخۆشبوو سەید موحسین سەمینی خۆشنووس، خوشکە ڕووناک جەمیل سائیب، هونەرمەندان خالید سەعید، عومەر عەلی ئەمین، قادر کوردی، سمکۆ عەزیز، نوری ئیسماعیل، ئیسماعیل خەیات، هەروەها کاک گۆرگین گریگۆر

چالاکییانەم بۆ زەمالەیەکی یونسکۆ لە پاریس پاڵێورام، بەڵام لەبەر کەمیی دارایی یونسکۆ پاڵاوتنەکەم دواخرا. شیاوی باسە چەند جارێ لە لایەن وەزارەتەوە بۆ چوونەدەرەوەی وڵات بۆ خوێندن پاڵێورام، بەڵام لە ئەنجامدا هیچیان سەریان نەگرتووە.ساڵی ١٩٦٥ نێردرام بۆ بەیروت بۆ هاوبەشیکردن لە دەورەی (ئاداب و علوم) لە زانکۆی ئەمەریکی. لەوێ لە کاتی دەورەکەدا پێشانگەیەکم ئامادە کرد کە لە لایەن دکتۆر (حەبیب ئەلکورانی)یەوە کرایەوە، زۆر لە لایان پەسەند بوو، توانیم هونەری ڕەسەنی کوردی بە ڕووناکبیرانی ئەوێ بناسێنم.

من لە ژیانمدا دەرسی وێنەم لە هەموو قۆناغەکاندا وتووەتەوە هەر لە باخچەی ساوایان و قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی تا خانەی مامۆستایان، جگە لە دەورە هونەرییەکان.

لە ساڵی ١٩٦٩وە تا ساڵی ١٩٧١ چوومە سعودیە و لە جێی مامۆستا شاکر حەسەن ئال سەعید بووم بە مامۆستا لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان.

یەکەم کەس بووم لەوێ هاوبەشی دامەزراندنی مۆزەخانەی پیشەسازیی میللی و هونەری میللی و فۆلکلۆریم لە پەیمانگەکەدا کرد. کە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧١دا گەڕامەوە سلێمانی، ماوەیەک لە ئامادەیی کچان و ماوەیەک لە قوتابخانەی سەرشەقام مامۆستا بووم.

پاشان کرام بە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بۆ کاروباری هونەر لە پەروەردەی سلێمانی. شیاوی باسە یەکەم سەرپەرشتیار بووم کە لەم پارێزگایەدا بۆ هونەر دابنرێم. پشتگیریی بەڕێوەبەری ئەوسای بۆ کارەبا و ساڵح خزیر بۆ وێنەگرتن و کاروباری ئێستگەی قوتابخانەکان. ئینجا لە دواییدا ئەم مەڵبەندە و مەڵبەندی چالاکیی قوتابخانە کران بەیەک.

بە شانازییەوە دەیڵێم: دامەزرێنەری هەردوو مەڵبەندەکە بووم، جێی شانازییشمە کە توانیم یەکەم مۆزەخانە بۆ جلوبەرگی کوردی و جلوبەرگی فۆلکلۆری جیهانی لە ناو ئەم مەڵبەندەدا بکەمەوە. لە ڕێگەی وەزارەتی پەروەردە و وەزارەتی دەرەوەوە توانیم دەنگی خۆم بگەیەنمە دەرەوە بۆ ئاڵوگۆڕی جلوبەرگ.

لە کۆنگرەی یەکەم هونەرمەندانی عێراقی لە بەغدا پێشانگەیەکی تایبەتیم بۆ جلوبەرگی کوردی کردەوە کە جێی ڕەزامەندیی گشت لایەک بوو. بەرامبەر بەم

پەروەردە مامۆستا (سامی حسێن نازم) هەرگیز لە بیرم ناچێ. ماوەی دوانزە ساڵ لەم کارەدا مامەوە. لە ئاراستەکردنی مامۆستایانی قوتابخانە سەرەتاییەکان بۆ پێگەیاندنی چرۆ تازە پشکوتووەکان و بۆ گەشەکردنی بەهرەی قوتابیان دەوری خۆمم بینی تا لە ١٩٨٥/١/١ لەسەر خواستی خۆم خانەنشین بووم، بەڵام ئایا خانەنشینی بۆ ئەدیب و هونەرمەند هەیە؟ بێگومان نەخێر، چونکە ئیتر دەستم دایە فڵچە و بۆیە و کەوتمەوە کارکردنی هونەری لە قۆناغی تازەمدا.

هەندێ وردەڕاز

١- باسێکی فراوانم دەربارەی شێوازی وتنەوەی وانەی پەروەردەیی هونەری هەیە و ساڵی ١٩٦٧ پێشکەش بە وەزارەتی پەروەردەم کرد.

٢- باسێکم بە ناونیشانی (لێکۆڵینەوەی ستاتیک) پێشکەش بە زانکۆی سلێمانی کرد، تیایدا دوو پێشنیازی گرنگم هەبوو:

ا/ مەڵبەندێک لە زانکۆ بکرێتەوە بە ناوی (مەڵبەندی باس و لێکۆڵینەوەی ستاتیک).

ب/ لە سلێمانی پەیمانگەیەک بۆ هونەرە جوانەکان بکرێتەوە.

٣- باسێکم پێشکەش بە کۆنگرەی یەکەمی هونەرمەندان لە بەغدا کرد دەربارەی بایەخدان بە وانەی پەروەردەی هونەری لە باخچەی ساوایان و قوتابخانەکاندا.

٤- سەبارەت بە بووکەشووشە و بووکەسەماکەرە باسێکم ئامادە کرد و بە هاوکاریی هاوەڵێکی سورییایی پێشکەشمان کرد بە زانکۆی ئەمەریکی لە بەیروت.

٥- سەبارەت بە گرنگیی مەڵبەندی ئیشی دەست و بایەخدان بە وتنەوەی ئەم مادەیە لە قۆناغی سەرەتاییدا و گەشەپێدانی توانای ڕاهێنان و پێگەیاندنی کادری کارامە، باسێکی فراوانم پێشکەش بە وەزارەتی پەروەردە کرد.

٦- ساڵی ١٩٥٨ یەکێک بووم لە ڕێکخەرانی (پێشانگەی کشتوکاڵ و ئاژەڵ) لە سلێمانی.

٧ – یەکێک بووم لەوانەی بۆ بایەخدان بە شانۆی منداڵ هەوڵم داوە و شانۆی باخچەی ساوایان بەری ئەو ڕەنج و تەقەللایەمە.

لێرەدا شتێکم دێتەوە یاد و بە هەلی دەزانم باسی بکەم: سەرەتای کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٢ بوو، دنیا سارد بوو، بەفر باریبوو، هاوڕێی خۆشەویستم مستەفا ساڵح کەریم کە لە ساڵی ١٩٥٧ەوە بووبووین بە هاوڕێ و برا، شتێکی زۆر گرنگ لێکی نزیک کردبووینەوە، دوو لاو لە سەرەتای لاوێتی و هیوا و ئاواتدا، ئەوێکی شەیدای ئەدەب و ڕۆژنامەنووسی، منی ئاشقی هونەر و ئەدەب، ئەم ئەشقە کردبووینی بە برا، نەک تەنها بە هاوڕێ.

ئەم برایەم لە چوارتاوە بە تەلەفۆن پێی وتم: کە لە قوتابخانەی چوارتای کوڕان کە ئەو بەڕێوەبەری بوو، شانۆییەکیان بە دەستەوەیە و پێویستیان بە ماکێرە، دەستم بە ڕوویەوە نەنا، بە ڕۆژێکی تۆف بەو ڕێگە پێچاوپێچە ناخۆشەی ئەوسادا چووم بۆ چوارتا، لە ڕێگە ئۆتۆمبێلەکەمان وەرگەڕا و کارەساتی ناخۆشیشم بینی، بەڵام کە گەیشتمە ئەوێ و ئەو جۆشوخرۆشەم بینی، هەموو ماندوویەتیم بیر چووەوە، ماکیاجی قوتابییەکانم کرد و بۆ ئێوارە پەردە کرایەوە و شانۆنامە پێشان درا لە ئامادەکردن و دەرهێنانی هاوڕێم (مستەفا ساڵح کەریم)، سەرکەوتنی شانۆییەکە بەختیارییەکی پێ بەخشیم کە مەگەر هەر هونەرمەند هەست بەو جۆرە بەختیارییە بکات.

٨- ساڵی ١٩٥٨ ڕێکخەر و دەرهێنەری میهرەجانی بەرگریی فۆلکلۆر و میللی بووم لە باخچەی

ئازاد شەوقی

ساوایانی سلێمانی و لەسەر شانۆی کتێبخانەی گشتیی ئەوسا پێشکەش کرا کە بەرامبەر بە مزگەوتی گەورە بوو.

٩- بایەخێکی زۆرم بە سامانی میللیی کوردی داوە بۆ ئەوەی باسەکانم بەپێز بکەم، هەمیشە پیاوانی ڕیشسپی و دنیادیدەم دیوە و دێهاتەکان گەڕاوم و دەربارەی خواردەمەنی و جلوبەرگ و گژوگیا و داوودەرمان و لاوک و حەیران و گۆرانی و لاواندنەوە و لایلایەی منداڵ پرسم کردووە.

١٠- تا ئێستا لە هیچ نەقابە و کۆمەڵێکی هونەریدا ئەندام نیم.

١١- وەک لەوەوبەر باسم کرد، چەند جارێک بڕیاری پاڵاوتنم دەرچووە بۆ دەرەوەی وڵات و لە ئەنجامدا کۆسپ و تەگەرە هێنراوەتە ڕێگەم، لەوانە:

ا/ ساڵی ١٩٦٥، زەمالەی یۆنسکۆ بۆ خوێندن لە پاریس.

ب/ ساڵی ١٩٥٧، زەمالەی وەزارەتی ئاوەدانکردنەوە بۆ ژاپۆن بۆ خوێندنی نەخشونیگاری قوماش.

ج/ ساڵی ١٩٥٨، ناردن بۆ ئەمەریکا بۆ خوێندنی دیکۆری شانۆیی مناڵ لە کالیفۆرنیا.

د/ کۆتایی ساڵی ١٩٥٨، زەمالەیەک بۆ کۆریا بۆ خوێندنی سیرامیک.

هـ/ ساڵی ١٩٥٩، ناردن بۆ ئیسپانیا بۆ خوێندنی (هونەری ڕیازەی ئیسلامی)، لە دواییدا گۆڕا بەوەی کە بنێردرێم بۆ ئێران بۆ هونەری تەونکردن و نەخشی فەرش، ئەمیش هەر سەری نەگرت، چونکە وەک زانیم، ئەمەیان بۆ ڕاهێنانە، نەک بۆ خوێندن و بڕوانامەشی نابێ. لەبەر ئەوە خۆم وازم لە چوون هێنا.

١٢- حەز بە هاوڕێیەتیی مناڵ دەکەم و زۆر دڵم بە وێنەی مناڵان دەکرێتەوە.

١٣- لە خوێن و دیمەنی خوێن زۆر دەترسم.

١٤- سروشتم خۆش دەوێ و سەرچاوەی هەموو هەستێکی هونەریمە.

١٥- بە شانازییەوە هاوبەش بووم لە چاککردنەوە و پاراستنی شانۆی ئامادەیی سلێمانی. پێشنیازیشم کرد کە هۆڵەکە پلیکەدار بکرێ.

١٦- کاتی خۆی ساڵی ١٩٥٢ لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان بە پێشنیازی من و یارمەتیی هونەرمەندی مەزن فایەق حەسەن گەشتێکمان بۆ شەقڵاوە و ڕواندوز و دیانە ڕێک خست، هەروەها باتاس و حەریر و حاجی هۆمەران و زینۆی شێخی و ڕایات. پازدە ڕۆژی خایاند، بەری ئەم گەشتەمان پێشانگەیەک بوو لە بەغدا ئامادەمان کرد.

١٧- ئەوەی پاش ٢٩ ساڵ خزمەتکردن لە پەروەردەدا شانازیی پێوە دەکەم، وشە جوانەکانی مامۆستایان و ڕێزگرتنی هونەرمەندان و ڕووناکبیران و ئەدیبانە کە هەمیشە مەدالیای زێڕینی بەرۆکمن.

١٨- پەیوەندیم لەتەک زۆربەی ئەدیب و هونەرمەندانداندا پتەوە، زۆریشیان هاوڕێی نزیکمن.

١٩- زۆربەی ئەو شانۆییانەی ساڵی ١٩٥٧ لە سلێمانی لە لایەن قوتابخانە سەرەتاییەکانەوە پێشکەش کران، من ماکیاجی قوتابییەکانم دەکرد.

٢٠- لە شانۆنامەی کاوەی ئاسەنگەردا دیسان ماکیاجی ئەکتەرەکان بە من سپێردرا.

٢١- کاتێک بۆ یەکەم جار لەم پارێزگایەدا لە شەستەکاندا هاوڕێم مستەفا ساڵح کەریم کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی مەڵکەندی و پاشان قوتابخانەی شێخ مەحمود بوو و گۆڤارێکی قوتابخانەی بە کوردی و بە عەرەبی بە ناوی (ڕابەر)ەوە دەرکرد، لە زۆربەی ژمارەکانیدا بە نووسینی وتاری هونەری بەشداریم دەکرد.

٢٢- ساڵی ١٩٨٢ دەربارەی تاقیکردنەوەی هونەریی خۆم کۆڕێکم لە لایەن نەقابەی هونەرمەندانەوە لە هۆڵی نەقابەکانی کرێکاران بۆ ساز کرا.

٢٣- ساڵی ١٩٥٧ لەتەک خوالێخۆشبوو هونەرمەند ڕەفیق چالاک و برایان مستەفا ساڵح کەریم و دیلان و نوری وەشتیدا لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان بووم لە سلێمانی.

ئازاد شەوقی

کورتەڕاز

هەر لە منداڵییەوە شەیدای دیمەنە جوانەکانی دێهاتی هەورامان بووم، بەتایبەتی بیارە و تەوێڵە. درەختی جوان، چیای سەرکەش، تاڤگەی ئاو، ڕاستگۆیی و زیرەکی و دەستپاکی و دڵسۆزیی خەڵکەکە. بۆیە هەرگیز لە بیرم ناچنەوە و لە تابلۆکانمدا ڕەنگ دەدەنەوە.

هەروەها دێهاتی پشدەر و ڕانیە، دیمەنی بەرەبەیان، کاتی زەردەپەڕ، ئاوی قولێ، سەروچاوە و بێتواتە، مەڕومالات، کار و بەرخ، دەنگی شوان و ئاوازی شمشاڵ. ئەمانە هاندەرم بوون بۆ زیاتر خۆماندووکردنم لە هێنانەبەری تابلۆکانمدا.

هەروەها دێهاتی گەرمیان، ناوچەی ئاغجەلەر و سەنگاو کارێکی زۆریان کردووەتە سەر بەرهەمەکانم، زووزوو سەرم لێ دەدان و بە دیداری کەسوکاری قوتابیان شاد دەبووم.

ئەو هونەرمەندانەی بە تاسەوە حەز بە هونەرەکەیان دەکەم، هەریەکە و لە بواری خۆیدا:

حەقی شیبلی، فایەق حەسەن، ئەسعەد عەبدولڕەزاق، جەواد ڕەسوڵ، ئیسماعیل شێخلی، ئیسماعیل خەیات، عەتا سەبری، مەحمود ئەلعوبێدی، محەمەد عارف، ئەحمەد سالار، سمکۆ عەزیز، مونیر بەشیر، غانم حەداد، هاشم ئەلڕەجەب، مونیر حەکیم، ئیبراهیم شعوبی، ئەنوەر قەرەداغی، خالید سەرکار، دلێر ئیبراهیم.

ئەو ئەدیب و شاعیرانەی بەرهەمەکانیان دەخوێنمەوە و چێژی تایبەتیم دەدەنێ:

ئەحمەد هەردی، جەمیل ڕۆژبەیانی، دکتۆر مارف خەزنەدار، دکتۆر ئیحسان فوئاد، دکتۆر عیزەدین مستەفا، دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، حەمەساڵح دیلان، شێرکۆ بێکەس، مستەفا ساڵح کەریم، حسێن عارف، محەمەدی مەلا کەریم، شکور مستەفا.

ئەوانەی لە ڕێبازی هونەریدا لە یەک کارواندا بووین و هاوڕێ بووین، ئەم هونەرمەندانە بوون: جەواد ڕەسوڵ ناجی، سلێمان شاکر، محەمەد عارف، خالید سەعید، ئیسماعیل خەیات.

لەو قوتابییانەیشم کە جێی شانازیمن:

عەلی جۆڵا و تاهیر ئیبراهیم -کە ئێستا لە ئەمەریکایە- سەردار زوهدی، لالە عەبدە و چەندین لاوی تر کە مایەی شانازی و بەختەوەریمن.

ڕەنگ

ئەو ڕەنگانەی لام پەسەندن:

پەمەیی، پرتەقاڵی، شینی ئاسمانی، وەنەوشەیی کاڵ.

بۆن

ئەم بۆنانەم لا خۆشن:

بۆنی کنێر، بۆنی نێرگز و وەنەوشە، بۆنی گوڵاو.

سەرئەنجام

هەرگیز چاوەکانم لە نیگای دیمەنەکانی گوندەکانی کوردستان، بەتایبەتی کوێستانەکانمان تێر نابن.

حەز بە بینینی خێڵ و بار دەکەم کە گەرمیانوکوێستان دەکەن، زۆرم پێ خۆشە کە دەچمە مزگەوتەکانی لادێ و سەرنج دەدەمە ئەو خەڵکەی لە گوێی حەوزی مزگەوت دەستنوێژ هەڵدەگرن و لە پاشان دوای نوێژکردن دەکەونە قسە و گفتوگۆ و حیکایەت.

چەند جوانە دیمەنی شوانی گوند کە لە کاتی خۆرئاوادا مەڕومالاتەکەی دەکات بە ئاواییدا، یان دیمەنی دەرچوونی بەیانیانی، زۆر دڵگیرە لام کە پۆلپۆل لاوان و کیژان دەچنە سەر کێڵگە و باخ و بێستان و مێرگ و مێرگوزار و لەوسەرەوە

به چەپکەگوڵی کێویلە بەدەم گۆرانی و ئاوازی خۆشەوە دەگەڕێنەوە، یان کۆبوونەوەی پیاوە بەساڵاچووەکان لەسەر بانیژەی ماڵەکانیان و گوێگرتن لە بیرەوەری و یادگارەکانی سەردەمی لاوێتییان، هەروەها ئەو فانۆسانەی بە کەپرەکانیاندا شۆڕ دەبنەوە کە بە دیار باخەکانیانەوە کردوویانە، لەتەک گۆرانیی لاوان و هەرا و بگرەی منالآن.
چەند خۆشە میوانی ماندوو کە لە کەپرەکە نزیک دەبێتەوە و کاسەیەک دۆی ساردی بۆ دەهێنن، دڵداریی پاکوبێگەری نێوان هەرزەکارانی گوند. ڕازوخوازی کیژۆڵە عاشقەکان لەسەر کانی، یان لە هەرەوەزیی درەوکردندا، یان لە کاتی کنگر و گێلاخە یا لە مازووچنیندا. ئەی دیمەنی شایی و زەماوەند و هەڵپەڕکێ و ڕەشبەڵەک و ڕمبازێن.

ئەوەی زۆر ڕام دەکێشێ:
وێنەکێشانی ڕیالیزم.
گونجاندنی شێوە و ناوەرۆک کە تەعبیر لە هیوا و ئاواتی مرۆڤ بکات.

کاری شوێنەوار
جێی خۆیەتی ئەگەر بڵێم: هەرچەندە باوکم فەرمانبەرێکی بچووک بوو، بەڵام یەکێک بوو لە ڕۆشنبیرانی سەردەمی خۆی، بۆیە خێزانەکەم لە جیهانی کەڵچەر و هونەر نزیک بووین. تەنانەت باوکم حەزی لە وێنەکێشان دەکرد، زۆر جار بۆ ئارەزووی خۆی دەستی دەدایە ڕەسمکردن. بەو شێوەیە من لە ماڵەکەدا وەک کوڕی گەورە مەشخەڵی هونەرم هەڵگرت و کەس دەستی نەهێنایە بەرم، بە پێچەوانەوە، باوکم پشتگیریی دەکردم، بۆیە بەرودوا برا و خوشکەکانم عاشقی هونەر بوون و بۆی دەسووتێن.

براکانم:
شێرزادی جوانەمەرگ؛ هونەرمەندێکی دەسترەنگین بوو.
نەهرۆ: یەکێکە لە هونەرمەندە ناسراوەکان.
ڕزگار: ئارەزووی ڕەسمکردن و خۆشنووسی و ڕۆژنامەنووسیی هەیە و تا ئێستایش مامۆستای هونەرە.
وریا: مامۆستای ڕەسمە و دەستی ڕەسمکردن و خۆشنووسیی هەیە.
ئاراس: هونەرمەندێکی خاوەن بەهرەیە.
سەرچڵ: هونەرمەندە، پێشانگەی تایبەتی پێشکەش کردووە.
کامەران: سەرەڕای ئەوەی ڕۆشنبیرێکی کارامەیە و زۆر دەخوێنێتەوە، هەروەها دەستێکی باڵای لە وێنەکێشان و فۆتۆگرافیدا هەیە.

خوشکەکانم:
ڕووناک و نازەنین:
هەردووکیان مامۆستای هونەرن و لێی نەپچڕاون و دەستی ڕەسمکردنیشیان هەیە.

نێرگزی براژنم، خێزانی ڕزگار:
هونەرمەندێکی وریا و زیرەکە، ماوەی بیستوسێ ساڵە لە قوتابخانەکانی سلێمانیدا وانەی ڕەسم دەڵێتەوە، هەموو ساڵێکیش پێشانگەیەکی تایبەتی لە بەرهەمی قوتابییەکانی پێشکەش دەکات.

خۆشیی برازام، کچی ڕزگار:
قوتابییە لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان، هاوینی ساڵی (١٩٨٦) لەتەک سەرچڵی برامدا پێشانگەیەکی هاوبەشیان لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی پێشکەش کرد، زۆر جێی ستایشی هونەردۆستان و هونەرمەندان بوو.

قۆناغی نوێی ژیانم، واتە لە کاتی خانەنشینیمدا
کاتێ کە خۆم بە خانەنشینی بینی، بۆم دەرکەوت کە ئیتر کاتی ئیشکردنی بەکەڵکە، ئەو بەرهەمانەم کە ئەنجامی چەندین سەرنج و ژانی تایبەتیم بوون،

بەرودوا لەدایک بوون.
هەرچەند لە تابلۆیەکم ئەبوومەوە، بە شادمانییەوە پیشان هونەرمەندە خاوەن تواناکانم دەدا، بەتایبەتی هونەرمەند ئیسماعیل خەیات کە بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەم بەرهەمە هونەرییانەمی دەکرد. هەمیشە شانازی بەو و بە هاوڕێکانیەوە دەکەم و شادمان بووم بە سەرنج و تێبینییەکانیان.
لەم ماوەیەدا هاوڕێ هونەرمەندەکان و دۆست و برادەران هانیان دەدام کە پێشانگەیەک پێشکەش بکەم، بۆ ئەوەی تابلۆکان هەر لە چوار دیواری ماڵەوە نەمێننەوە و بکەونە بەرچاوی جەماوەر، بەڵام من چاوەڕوانم کرد تا بتوانم چاکترین بەرهەم پێشکەش بکەم... کە وایان لێ هات ئیتر ڕوو بکەنە جەماوەر، دەستم بە ڕووی مامۆستای گەورەم ئیسماعیل شێخلییەوە نەنا و لەسەر خواستی ئەو و هەڤاڵە هونەرمەندەکانم خۆم بۆ ئەم پێشانگەیە ئامادە کرد.

هاوڕێ و برام هونەرمەند ئیسماعیل خەیات هەندێ لەو بەرهەمانەی هەڵبژارد کە زۆربەیان بە ڕەنگی پۆستەر و هەمەچەشن ڕەسم کراون. دەتوانم بڵێم ئەم بەرهەمانە بەری تێڕوانینی منن سەبارەت بە شوێنەواری میللی و سروشتی ڕەنگین.
بەگشتی، لە بزووتنەوەی شەپۆلی داهێنانی هاوچەرخ دوورەپەرێز نیم، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی لەتەک ڕەسەنایەتیی سامانی میللیدا دەژیم، بۆیە خواستەکانم بە شێوەیەکی ڕیالیزمی و کاریگەرانە لە شوێنەوار و سروشتدا بەدی دەکەم.
وەک هونەرمەندێک ڕاستییەک دووپات دەکەمەوە: چەسپاندنی کۆڵەکەی ویژدان بە ڕەسەنایەتیی سامان و جێدەستکردنەوە وەک هونەرمەندێک بەرەو داهێنان. بۆیە دەڵێم: پێویستە هونەرمەند ڕێزی تایبەتی هەبێ بۆ دابونەریت و پشتیان تێنەکا و هەوڵ بدات بیانپارێزێ تا بتوانێ لەتەک جەماوەردا بە زمانی ئەوان بدوێ.
دەبێ هونەرمەند کۆشش بکات بۆ خوڵقاندنی هۆشیاریی هونەریی، دەبێ نەخشەی تایبەتی بۆ خودی خۆی کێشابێ کە ماوەیەکی فراوان بۆ خۆی برەخسێنێ بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی سامان و دڵسۆزی لە هەستکردن بە هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی. هەروەها هەوڵ بدات

ئازاد شەوقی

ئاسۆی ڕووناکبیریی خۆی فراوان بکات و هەست بە جوانیی ژیان بکات. سەرەڕای هەڵهێنجان لە سەرچاوەی شارستانێتیی کۆن و سەردەمدا، دەبێ پەیوەندیی پتەو بێ بە جەماوەر و بڕوایان بە خۆی بەهێز بکات تا بتوانێ بەوپەڕی لێهاتووییەوە ببێتە هونەرمەندێکی بەتوانا و دڵسۆز بێ بۆ ئامانج و ئاواتەکانیان.

جێی شانازیمە کە ناوبەناو هاوڕێکانم لە ئەدیبان و هونەرمەندان دیدەنیم دەکەن، نایشارمەوە دەڵێم توانای هونەریم بە سەرنجە بەسوودەکانیان بەهێزتر دەبێ، چونکە لەتەکما دەکەونە گفتوگۆ لەسەر بەرهەمەکانم، بە ڕێزەوە گوێ بۆ بیروڕا و ڕەخنەکانیان شل دەکەم، ئا لێرەوە هەست دەکەم ڕێبازی هونەریم ڕوونتر دەبێ و بەرهەمەکانم زیاتر دەچنە دڵی خەڵکییەوە.

وشەیەکی وەفاداری و پێزانین

لە کاتێکدا چاوێک بە تابلۆکانمدا دەگێڕم کە وەک جگەرگۆشەی خۆم سەیریان دەکەم، کەسانێکم دێنە یاد کە هەریەکەیان، کەم یا زۆر، دەستێکی هەبووە لە گەشەپێدان و فراوانکردنی مەیدانی هەمەجۆری هونەری سامانی نەتەوەکەمان، یاریدەدەر و هاندەرم بوون بۆ پێشکەشکردنی ئەم بەرهەمانە و ئامادەکردنیان بۆ پێشانگە، لەوانە:

هونەرمەندی خوالێخۆشبوو مامۆستا حەقی شیبلی

هونەرمەندی مەزن مامۆستا ئیسماعیل شێخلی

دکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی

دکتۆر مارف خەزنەدار

مامۆستا جاسم ئەلعبودی

مامۆستا عەبدولسەمەد ئەلسامەرائی

مامۆستایان ئەحمەدی هەردی، حەمەساڵح دیلان، ئیسماعیل خەیات، مەحمود تۆفیق خەزنەدار، جەمال عەبدول، مستەفا ساڵح کەریم، حەمەنوری تۆفیق، جەمال خەزنەدار، غەریب پشدەری، عەلی عەزیز، شێرزاد جەباری، هونەرمەند حەمەڕەزا، عوسمان هەورامی، وسوی حەمەدبەگ و خوشکە قادریە عەلی مەردان.

هەروەها بە پێویستی دەزانم لەم بوارەدا سوپاسێکی بێپایانی ئەو مامۆستا دڵسۆزانە بکەم کە لە قەڵادزە و ڕانیە و بێتواتە و تەوێڵە و بیارە و چەمچەماڵ و ئاغجەلەر و سەنگاو و بەستەسێن یارمەتییان داوم و کاری گرانیان بۆ ئاسان کردووم، هیوام وایە نموونەیان هەر لە زیادبووندا بێ.

هەر لەم بوارەدا ڕێز و خۆشەویستیم بۆ ئەو هونەرمەندانەی بە شانازییەوە لەم بوارەدا و لەم پارێزگایەدا پێشڕەو بوون لەوانە: ئەنوەر تۆفیق، خالید سەعید، حەسەن فەلاح، عەزیز سەلیم و جەمال بەختیار.

چەپکێ گوڵی ڕەنگاوڕەنگیش بۆ سەر گۆڕی هونەرمەندی جوانەمەرگ (شێرزاد شەوقی). بە هیوام مەشخەڵی هونەر لە شارەکەمدا هەرگیز بڵێسەی کز نەبێ، زۆریش دڵشادم کە پەیمانگەکانی هونەرە جوانەکان و ئەکادیمیا بەردەوام هونەرمەندی لاو پێدەگەیەنن و ئەوانیش بە شانازییەوە ئاڵای هونەر لە دەستی نەوەی پێشوویان وەردەگرن.

لەو هونەرمەندە تەشکیلییانەی لای خۆمان کە زۆر بە پەرۆشەوە حەز بە بینینی بەرهەمەکانیان دەکەم: ئیسماعیل خەیات، نوری ئیسماعیل، کامیل ئەحمەد مەعروف، دارا حەمەسەعید، حیکمەت هیندی، سلێمان شاکر، محەمەد فەرەج، کۆسرەت جەمال غەفوور و ناسر.

# هونەرمەندی سروشت
# ( ئازاد شەوقی )

## ڕزگار فەقێ عەولا

ئازاد شەوقی یەکێکە لەو هونەرمەندانەی کە بە هۆی هێز و بینین و لێکدانەوەی ڕەنگەکان و سەربەخۆیی تایبەتی، توانیویەتی زیادەیەکی هونەری بۆ سروشت دروست بکات و هەروەها سروشت بە چاکترین شێوەی هونەری بنەخشێنێتە سەر تابلۆکانی.

بۆچوونەکانی ئەم هونەرمەندە هەستناسکە بۆ هونەرەکەی ئەوەیە کە دەبێت هونەر جوان بێت، بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونە هونەرییانەی کە تایبەتن بە کاری هونەریی پەیکەرتاش و هونەری بیناسازیی نوێ، کە هونەرمەند هەست بە جۆرە بێزارییەک دەکات، چونکە وا دەبینێت کە ئەو کارە هونەرییانە زیاتر هونەرین بەبێ هیچ جوانییەک، هەروەها زۆر بێکەڵک و بێبایەخن، بەڵام ئەگەر کارێکی هونەریی جوان ببینێت یان چاوی بە کارێکی جوانی سروشتی بکەوێت، ئەوا بە تەواوی هەست بە حەسانەوەیەکی هونەری دەکات. بەم جۆرە ئەم هونەرمەندە بەم شێوەیە پێناسەی جوانیی سروشت دەکات (ڕەنگدانەوەی ناخی مرۆڤە بۆ بینینی ڕەنگ و جوانییە دەرەکییەکان).

ئازاد شەوقی ساڵی ١٩٢٩ لە شاری هەولێر لەدایک بووە، ساڵی 1955 پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواو کردووە. هونەرمەند هەر لە سەرەتای کارکردنی هونەرییەوە، خۆشەویستیی بۆ ڕەنگ و سروشتی کوردستان هەبووە. ئەم هونەرمەندە بلیمەتە لە خۆیەوە ڕەنگەکانی لە بۆشایی تابلۆکانیدا دانەناوە، بەڵکو چاو و هەستی بینینی جوانیی سروشت زۆر بەهێز و بەتوانا بوونە، توانیویەتی بینینی

جوانیی هونەریی جیهانی نوێ ڕەچاو بکات و جوانیی سروشت بکاتە هەوێنی تابلۆکانی.
ئازاد شەوقی بە هەستێکی بەرز و قووڵبوونەوەیەکی ورد چارەسەری کارە هونەرییەکانی خۆی کردووە، بە مەرجێ هیچ هونەرمەندێکی کورد وەک ئازاد شەوقی ئەم جۆرە تێڕوانینانەی نەبووە بۆ جوانیی سروشت، هەروەها چۆنیەتیی فڵچەوەشاندن لە کاتی ئیشکردندا.
هونەرمەند جۆرە چێژێکی بەرفراوانی هونەری دەرەکیی هەیە بۆ دابەشکردنی ئیقاعی ڕەنگەکان، هەروەها لە نیگای چاوەوە ئاسمانە لێڵ و تەماوییەکان دەبینێت، ئەوە پاش تەواوکردنی تابلۆیەک، سروشتێک بونیاد دەنێت و هەروەها بۆ چارەسەرکردنی کارە هونەرییەکەی تەواو سوودی لە هونەرمەندە بەرزەکانی جیهان وەرگرتووە، وەک (سیزان، مۆنیە، ڤان گوخ).
مرۆڤ چێژ لە هەموو کارە هونەرییەکانی ئازاد شەوقی وەردەگرێت و گیانی هێمن دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی سروشتێکی جووڵاوت پێشکەش دەکات بە پێچەوانەی سروشتی وشک و بێگیان.

سروشت لای ئازاد شەوقی گۆڕانە، نەک گێڕانەوە و تەقلیدییەت. ئەو بە نیگایەکی کراوەوە دەڕوانێتە سروشتی لادێکانی کوردستان. گواستنەوەی ڕەنگە جووڵێنەرەکان بۆ سەر تابلۆکانی زیاتر بوێری و لێهاتوویی هونەرمەند بەدەردەخات. هونەرمەند بۆ دروستکردنی شەقام و کۆڵان و شاخ و ڕووبارەکان بە هەستێکی هونەریی زۆر بەرز دەڕوانێتە سروشت.
ئازاد شەوقی لە هونەری هێڵکاریدا دەستێکی باڵای هەیە، چونکە لە تابلۆی (شاری پێنجوێن، ساڵی 1987 – هێڵکاری)دا بە تەواوی هێز و پایەی پەنجەکانی بۆ کاری هێڵکاری لەگەڵ بابەتەکاندا بۆ خەیاڵ و هەواڵی جیهانێکی غەریبیمان دەباتەوە، هەروەها لە کاری تەکنیکی هونەریدا بێبەرانبەرە، بۆ نموونە، بەکارهێنانی (شانەی دار) لەجیاتیی فڵچەوەشاندن لە هەندێک شوێنی تابلۆکانیدا دەبینرێت. بەم جۆرە، پەیوەندییەکی بەتین لە نێوان ئازاد شەوقی و سروشتدا هەیە، هەر ئەو جۆرە پەیوەندییەش وای لە هونەرمەند کردووە هونەرمەندی سروشت بێت. چوارەم پێشانگەی تایبەتی هونەرمەند بە

تەواوی بلیمەتی و لێهاتوویی تێدا دەردەکەوێت، هەروەها پێشکەوتنێکی ئاشکرا بە کارە هونەرییەکانیەوە دیارە و سروشتی کوردستان لە تابلۆکانیدا ڕەنگ دەدەنەوە. لێرەدا پێویست ناکات مرۆڤ هەوڵێکی زۆر بدات بۆ تێگەیشتنی تابلۆکانی هونەرمەند ئازاد شەوقی، بەڵکو هەر هەموو کارە هونەرییەکانی سروشتێکی زۆر سادە و جوانن، چونکە کارە هونەرییەکانی ڕەنگدانەوەی باری دەروونیی هونەرمەند و کات و شوێنی کارکردنە هونەرییەکانە.

ئەو دەیەوێت بچێتە ناو دڵی سروشت بێ ئەوەی زۆر خۆی هیلاک بکات، بەڵکو زۆر بە هێمنی و سادەیی کارە هونەرییەکانی ئەنجام دەدات.

ئازاد شەوقی بە بینینێکی تایبەتی سەیری سروشت دەکات، لە سەرووی لوتکەی چیاکانی کوردستان سەرکەوتوانە دۆڵ و دەشتی ئەم سروشتە جوانە دەنەخشێنێتە سەر تابلۆکانی، تاقیکردنەوە هونەرییەکانی وای لە هونەرمەند کردووە ڕەنگەکانی بەشەوق و سەرنجڕاکێش بن، هەروەها باران و بەفر و هەوری لێڵ و تەماویی سەر چیاکان لە خزمەتی ڕەنگەکانی تابلۆی هونەرمەندا بن.

زۆر بە سانایی پەیوەندیی خۆشەویستی لە نێوان جەماوەر و تابلۆکانی ئازاد شەوقیدا دروست دەبێت، بە مەرجێک کە مرۆڤ نەتوانێت واز لە بینینی کارە هونەرییەکانی هونەرمەند بهێنێت.

دروستکردن و بونیادنانی جیهانێکی پڕ لە ڕەنگ و جوان وای لە هونەرمەند کردووە کە بتوانێت بە تەواوی سروشت تێهەڵکێشی تابلۆکانی بکات.

بە شێوەیەکی (ڕەمز) شاخی بەکار هێناوە. هەروەها کردوویە بە باگراوندی دواوەی تابلۆکانی بۆ ئەوەی بتوانێت بە شێوەیەکی تەعبیریی تەواو چاوی جەماوەر بە کارە هونەرییەکانی ڕابهێنێت. دەشت و دۆڵ و چیاکان نیشانەی ئازایەتی و لێهاتوویی هونەرمەندن بۆ کارە هونەرییەکانی، هەروەها قووڵبوونەوە و تێڕامانی ورد ڕەنگدانەوەی دەروونی هونەرمەند لە تابلۆکانیدا نیشان دەدات.

هەرگیز لە تابلۆکانی ئازاد شەوقیدا مرۆڤ لە سروشت جیا نەبووەتەوە، هەروەها تابلۆکانی ئاوازێکی بەجۆش دەبەخشنە گیانی مرۆڤ، بە جۆرێک، هەندێک جار خۆشەویستی بەرز دەبێتەوە، هەروەها هەندێک جار ڕەنگەکان خۆیان لە سروشت دەئاڵێنن، بەڵام لە سەرووی هەموو ئەمانەوە، سروشت پەیوەندیی جوانیس خۆی لەگەڵ تابلۆکانی هونەرمەند نەپچڕاندووە. هەموو جارێک خۆشەویستیی سروشت لە کارەکانی ئازاد شەوقیدا دووبارە دەبێتەوە. هەر ئەمەشە وای کردووە کە بە بەردەوامی جوانیی سروشت لەگەڵ ژیانی مرۆڤ هاوتەریب بێت، خۆسەویستی بیرکردنەوەیەکی دەروونییە لای هونەرمەند، لەبەر ئەوەی ئامانجە هونەرییەکانی دەمودەست دێنە بەرهەم.

بەم جۆرە، خۆشەویستیی سروشت نیشانەی سەرکەوتنە، هەروەها خۆشەویستیی خەونە ڕابوردووەکان نیشانەی خولقاندنی تابلۆیەکی ڕەنگینە. بەم جۆرە، هەموو شتە خۆشەویستەکان ئامانجی داهاتووی هونەری هونەرمەند مسۆگەر دەکەن.

ڕەنگدانەوە هونەرییەکان و خۆشەویستیی هونەرمەند بۆ سروشت ئەوەی سەلماندووە ئازاد شەوقی کوڕی سروشتی کوردستانە...

ئازاد شەوقی

# بەهای ڕەنگ و دەرکەوتنی سروشت لە تابلۆکانی هونەرمەند ئازاد شەوقیدا...

**بورهان هەژار**

پێشەکی

ئەوا جارێکی تر هانام بۆ ئامێزی بەشە کوردییەکەی ڕۆژنامەی عێراق، واتە پاشکۆی ئێستا هێنایەوە بە مەبەستی بەردەوامیدان و تەواوکردنی ئەو هەڵقە نووسینە هونەرییانەی لەسەر هونەرمەندانی شێوەکاری کورد دەستم پێ کردبوون. لە سەرەتای ئەمساڵدا دوو بەشی لەسەر هونەرمەند "محەمەد عارف" بڵاو کرایەوە، ئەوا ئیتر گەڕامەوە بۆ باوەشی لاپەڕە گەشەدارەکانی پاشکۆی عێراق بۆ تەواوکردنی چەند هەڵقەیەکی تر لەسەر هەڵسەنگاندن و سووکە ئاوڕدانەوەیەک لە بەرهەم و شاکار و بەهای هونەریی خامەڕەنگینی هونەرمەندی پێشەنگی ئەمڕۆی بزووتنەوە هەژارەکەمان... هەتا لە داهاتوودا بە شێوەیەکی تێروتەسەل و زانستییانەتر لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەین و بتوانین گەر وەک نامیلکەیەکی بچووکیش بێ، بە چاپ بگەیەنرێ و خزمەت بە تیۆری نووسینی هونەری شێوەکاری کوردیمان بکەین... ئەم کورتەنووسینەی ئەم جارەم لەسەر مامۆستا و هونەرمەندی ڕابەر مامۆستا "ئازاد شەوقییە". هیواخوازم بتوانم چەپکێ

ڕۆشنایی بهاوێژمه سەر تابلۆ ڕەنگینەکانی و لایەکی بەویژدانانەی لێ بکەمەوە...

جوانیی ڕەنگ و بارودۆخی دڵڕفێن
هەروەک زۆربەمان دەزانین، مامۆستای هونەرمەند لە ڕێگەی پێشانگە بەخششییەکەیەوە (التكريمي) خۆی و بەرهەمی جوان و ناسکی پێ ناساندین و سەلماندنی کە هەردەم بەردەوامە لە بەرهەمهێنان و پێشکەشکردنی بەرهەمی نایاب و ڕەنگینی هونەری... ئەویش ئەوە بوو لە ناوەڕاستی مانگی ٣ی ئەمساڵدا لە هۆڵی ڕەشید، نزیکەی ٥٠ تابلۆی نیشانی جەماوەر و هونەردۆستان دا. هەرچەندە هونەرمەندی ناوبراو یەکێکە لە ڕابەر و شۆڕەسوارانی مەیدانی شێوەکاریی ئەمڕۆمان و لە ٣٠ ساڵ لەمەوبەرەوە چالاکیی هونەریی نواندووە، لە کاری هونەری نیگارکێشاندا بەردەوام بووە لە پەروەردەکردن و خزمەتکردنی قوتابیان، بەڵام بە هۆی بارودۆخی تایبەتییەوە ماوەی چەند ساڵێ دوور کەوتەوە. وەنەبێت مەبەستم لەوە بێت کە لە کاری هونەری و نیگارکێشان وەستابێت، بەڵکە بە پێچەوانەوە، بێگومان ئەو پێشانگە قەشەنگ و سەرکەتووەی هونەرمەند، بە تەواوەتی کاریگەریی خستە سەر ئاستی ئەمڕۆی هونەری شێوەکاری عێراقی بەگشتی و هونەری کوردی بەتایبەتی...
کاتێ بینەر ڕووبەڕووی بەرهەم و شاکارەکانی ئەم هونەرمەندە دەبێتەوە، هەست بە هەناسەیەکی گەش و دڵڕفێن دەکات و وردەوردە بەرەو جیهانی ناواخنی دیمەنی نیگارەکان شۆڕ دەبێتەوە و هاوجووتی یەکە پێکهاتووەکانی بابەتی تابلۆکان دەبێت.
ئەگەرچی هونەرمەند لە ڕێچکە و شێوازی کاری نیگارکێشانیدا خۆشەویست و هۆگری جوانی و ڕەنگینیی سروشتی ڕازاوەیە و ئەیەوێ هەست و هۆش و دەربڕینی بۆچوونی ڕەنگ بداتەوە، بەرامبەر دەرخستن و ئاوەڵاکردنی بوون و پتەوی و پەیوەندیی مرۆڤ بە سروشتەوە، کە تا چ ڕادەیەک، بوون و هەڵکەوتنی سروشت، گرێدراو و پابەندی ژیانی مرۆڤە، سروشت بەو هەموو جوانی و خوڵقاوی و بوونەوەیە بە دیمەنی ڕەنگین و شاخ و تەپۆڵکە و قەڵبەزەی چەم و سەوزایی دەشت و دارستان و زەردەی دەم کەلی ئێواران و پێچاوپێچیی تووڵەڕێی باریک و... هونەرمەند زیرەکانە سوودی لەم چاوگ و سەرچاوە دەوڵەمەندە لەبنەهاتووە وەرگرتووە کە پەنجەی ڕۆشنی هونەریی تیا نەخشاندووە و جارێکی تر بە شێوەی خۆشەویستی و هۆگریی بەرامبەر بە بوونی تاکێتیی سروشت بگوازێتەوە و بە شێوەیەکی هونەرییانە دایان بڕێژێتەوە...
هەروەک دەزانین، هونەرمەند لەڕادەبەدەر کاریگەرە بە سروشت و پاراستنی ئەو ناوچە و دیمەنە جوانانەی بەرچاوی کەوتوون و لە کیسی خۆی نەداون. دەبینین ئەو بەرهەم و نیگارانەی هونەرمەند کێشاونی، لە ڕادە و پلەیەکی بەرزی هونەریدان و پەنجەی بلیمەتی و هێز و توانای تێدا ڕەچاو دەکرێت، کە من بەشبەحاڵی خۆم دەڵێم ژیانێکی دینامیکیی بەخشیوەتە گیانی دیمەنی نیگارەکان، کە چاوی بینەر دەخەنە حاڵەتی بەختیارییەوە کە بە تەواوەتی هەست بە بوونی شتە کاریگەر و پێکهاتووەکانی ناو سروشت دەکرێ – کە هەست بە بەهای جوانکاری و هێز و گەرموگوڕی بە داڕشتن و تێکەڵاوکردنی گشت پەڵە ڕەنگێک دەکرێ و بارودۆخی گشتی لە نیگارەکانیدا بە پلەیەکی چاک لەبار و گونجاون... واتە شیکردنەوەی (تحليل) لە ڕەنگدا لەگەڵ پاراستنی هێز و بەها و نرخی ڕەنگ و

ئازاد شەوقی

پلەپلەکردنیان (تدریج)...
شێوەی نیگارکێشانی هونەریی هونەرمەندمان دەچێتەوە سەر ڕێچکە و شێوازی "ڕیالیزمی سەرنجی" "الواقعیة الانطباعیة".
بەڵام لێرەدا خاڵێک هەیە زۆر گرنگە کە پەنجەی بۆ ڕابکێشین، ئەویش ئەوەیە کە هونەرمەند زۆر هۆشیارانە مامەڵە لەگەڵ چۆنیەتیی دارشتنی بابەتی ناوەڕۆکی تابلۆکانیدا دەکات، دەبینین کەمکردنەوە (اختزال) دەداتە بوون و هەڵکەوتنی شێوەی سروشت کە لە هەمان کاتدا چڕوپڕییەکی تەواو دەنەخشێنێتە گیانی دەربڕین، کە ئەمەش لە ڕەگوڕیشەی ڕەسەنایەتییەوە هەڵقوڵاوە... دەبینی زۆربەی نیگارەکان بریتین لە بارودۆخ و دیمەنی جوانی و ڕازاوەیی ناوچەکانی کوردستان، بەبێ دەرکەوتنی مرۆڤ... بەڵام هونەرمەندمان لە نیگارەکاندا زیرەکانە پەنجە بۆ بوون و ڕەگوڕیشەی داکوتراوی مرۆڤی ناوچەکە ڕادەکێشێت بە دروستکردنی خانووبەرە و دێراو و ڕێگە و شوێنی کشتوکاڵ و چەم و بێستان و... کە ئەمانە تێکڕا بەرهەمی عارەقڕشتن و ماندووبوونی مرۆڤی کوردن. ئەم ناسینەوەیەش لە ڕوخساری (ملامح) شتە ونەکاندا لە دیمەنی سروشتەکەدا دەبینرێ... لەبەر ئەوە دەبینین هونەرمەند وێنەی سروشتێکی قەرەباڵغ دەکێشێت. کە ئەمەش گرنگیدانە بە چۆنیەتیی تێڕوانینی هونەرمەند بەرامبەر بەو ڕیالیست و سروشتە ڕازاوەیەی سەرنجی پیا دەنەخشێنێ. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دڵسۆزی و ڕاستگۆیی هونەرمەند بەرامبەر بە ڕەسەنایەتیی هونەر و پتەوکردنی بەهرەی ناسک و خاوێنی لە کاری نیگارکێشاندا کە هۆکارێک بێت لە خزمەتکردن و بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری و هۆشیاریی جەماوەر... لەم کورتە نووسینەدا هێندە ماوە بڵێم هیوای تەمەندرێژی و بەردەوامیی زیاتر بۆ هونەرمەندی ڕابەر و چالاک مامۆستا "ئازاد شەوقی" دەخوازم کە پەنجەی ناسک و پڕبەهرەی گەشەدارتر بێت لە نەخشاندنی بەرهەمی بەپێز و ناسکی هونەریی تردا. لێرەدا هێندە بەسە هەتا پێشکەشکردنی پێشانگە نوێیەکەی کە لە مانگی ١ی ساڵی داهاتوو لە هۆڵی "ڕەواق" سازی ئەدا، ئەوساش چەند لاپەڕەیەکی تر لەسەر ئەو بەرهەمە نوێیانە دەنووسین.

### ئازاد شەوقی لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا:

# یاریکردن بە ڕەنگ وەك گەمەی میوزیسیان وایە لەگەڵ گیتارەکەیدا

**ئامادەکردن و پێشکەشکردنی: فریال حسێن**

گەر بمانەوێت هونەرمەند ئازاد شەوقی پۆلێن بکەین، ئەوا ڕاستەوخۆ پاش هونەرمەندە پێشەنگەکان دێت و یەکێکە لە هونەرمەندە یەکەمینەکانی کورد کە خوێندکاری مامۆستا گەورەکانی وەکو (فایەق حەسەن، ئیسماعیل شێخلی، فەرەج عەبۆ، عەتا سەبری و جەواد سەلیم)ی ڕەحمەتی بووە.
هونەرمەند ئازاد شەوقی ساڵی ١٩٥٥ بڕوانامەی دیپلۆمی لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکان لە بەغدا بە دەست هێناوە، لە هاوڕێکانی (نوری ڕاوی، کازم حەیدەر، ئیسماعیل فەتاح و میران سەعدی)ن.
هاوڕێیانی ئازیز: هونەرمەند ئازاد شەوقی خەڵکی شاری سلێمانییە و ماوەیەکی زۆرە نەگەڕاوەتەوە بۆ بەغدا، ئەم پێشانگەیەی ئێستای کە لە هۆڵی ڕەواق کراوەتەوە، هەلێکە بۆ ناسینی ئەم هونەرمەندە، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بە بێدەنگی مایەوە کە نزیکەی ٣٠ ساڵی خایاند.

**سەرەتا بەخێرهاتنی هونەرمەند ئازاد شەوقی دەکەم بۆ بەشداریکردنی لە بەرنامەکەماندا، دەمەوێت کۆمێنتی خۆتم پێ بڵێیت لەبارەی ئەو وتانەی دەسپێکەکەم؟**

- زۆر سوپاس، بە شێوەیەکی ئاسایی من زۆر بە کەمی ئیش دەکەم، بەڵام زۆر گرنگی بە کوالیتی دەدەم و دەگەڕێم بەدوای کەشێکی گونجاودا بۆ نمایشکردنی کارەکانم، پێم وایە ئەم کارەی ئێستام و ئەزموونی کاری ساڵی ڕابوردووم وای کرد چاوم بە کۆمەڵێک لە هونەرمەندانی هاوپیشەم لە بەغدا بکەوێت تا ئەم پێشانگەیە بکەمەوە کە ٤٢ تابلۆ لەخۆ دەگرێت. ئەمەش پێشانگەی سێیەممە.

**ئەی پێشانگەی دووەمت کەی بوو؟**

- پێشانگەی یەکەم ساڵی ١٩٧٣ بوو، پێشانگە نەبوو، بەڵکو کۆمەڵێک لە هاوڕێیان و هاوپیشەکانم بوون لە بەغدا، من لە دەرەوەی بەغدا بووم کە بیستم لە کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردیی بەغدا پێشانگەیەک هەیە کە هونەرمەند (محەمەد عارف) ڕێکی خستبوو، بەڵام پێشانگەکەی کە تیایدا خەڵات کرام، ئەوە لە لایەن هونەرمەندی هاوڕێم (ئیسماعیل شێخلی)یەوە بانگهێشت کرابووم کە بە دەستپێشخەری لە لایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنەوە خەڵات کرام، پێشانگەکەش لە هۆڵی ڕەشید بوو.

**کاک ئازاد من دەڵێم، ئەمە پێشانگەی چوارەمە نەک سێیەم؟ لەبەر ئەوەی لە شەستەکاندا (١٩٦٥) لە بەیروت پێشانگەیەک هەبوو، تۆ نەچوویت بۆ پێشانگەکە، تۆ چوویت بۆ بەشداریکردن لە خولێک لە زانکۆی زانست و وێژەکانی ئەمەریکی لە بەیروت؟**

- بەڵێ خولێک بوو لە زانکۆی ئەمەریکی لە بەیروت، کاتێک کە زانییان نیگارکێشم، کۆمەڵێک مەتریاڵی هونەری و کاغەزی باشیان بۆ ناردم، هەستم کرد کە پێویستە شتێک لە کارەکانم پێشکەش بکەم، بۆیە لە زانکۆی ئەمەریکی پێشانگەکەم کردەوە، ئەوەش پێشانگەی چوارەمم بوو، چونکە سێ پێشانگەکەی تر لە بەغدا بوو.

**کەواتە ئەمە پێشانگەی چوارەمتە؟**

- من دەڵێم سێیەمم، چونکە سیانەکەی دیکە لە بەغدا بوو، ئەوەی دیکە لە دەرەوەی وڵات بوو لە بەیروت.

**بیستم کە تۆ لە خانەوادەیەکی هونەریت، باوکت وێنەی کاریکاتێر دەکێشێت، یەکێک لە براکانت (برا گەورەکەت) نیگارکێشە، ئایا کاریگەریی خانەوادەکەت لەو کاتەدا چی بوو لەسەرت ؟**

- هەندێک جار باوکم وێنەی کاریکاتۆریی دەکێشا، منیش کە خوێندکاری سەرەتایی بووم، وێنەکانمم پیشان دەدا کە لە دەفتەری وێنەکێشان وێنەم دەکێشان، ئەویش بە ڕێز و بایەخەوە دەیڕوانییە وێنەکانم، بەڵام نەک هەر براکانم، بەڵکو خوشکەکانیشم کاریگەر بوون بە من، هەموویان مامۆستای پەروەردەی هونەری بوون لە خوێندنگە سەرەتایی و ناوەندییەکاندا.

114

تۆ ساڵی ١٩٥٥ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانت تەواو کرد، خوێندکاری هونەرمەندان (فایەق حەسەن، ئیسماعیل شێخلی، فەرەج عەبۆ، جەواد سەلیم) بوویت، بەڵام تۆ بەوان کاریگەر نەبوویت، بەڵکو تەنها کاریگەر بوویت بە هونەرمەندی خوالێخۆشبوو حەقی شیبلی؟

– لەبەر ئەوەی کێشەیەکی گەورەم هەبوو. هونەرمەند حەقی شیبلی وەک ڕێبەرێک و هونەرمەندێکی گەورەی شانۆکار بوو کە زانیاریی تەواوی هەبوو لەسەر هەموو لایەنەکانی هونەرە جوانەکان لە عێراق و پسپۆڕی تایبەت بوو لە بواری چالاکیی قوتابخانەکان کە خۆی بەڕێوەبەری گشتی بوو. بۆیە کێشەکەم لەگەڵ خانەوادەکەم هەبوو لە پەنجاکاندا، چونکە کاتێک چوومە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان، باوکم پێی ناخۆش بوو، وتی من نامەوێت ببیتە نیگارکێش، من حەزم لە نیگارکێشان هەیە، بەڵام نامەوێت تۆ ببیت بە نیگارکێش، لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگەدا پەسەند ناکرێت، بواری دیکە هەیە لە ژیاندا دەتوانیت هەڵیانبژێریت.

لە ڕەتکردنەوەی باوکم یاخی بووم. بۆیە ئەوانیش بۆ ماوەی چوار مانگ ئەو پارەیەیان بری کە بۆیان دەناردم. بۆیە مامۆستا (حەقی شیبلی) کاریگەریی مەعنەویی گەورەی هەبوو. خۆی و هاوڕێکانی توانییان قەناعەت بە باوکم بکەن و وتیان ئەو پەیمانگەیە شوێنێکی بەڕێزە و ئازادیش دەیەوێت ئەوێ تەواو بکات و دەبێت بە مامۆستایەکی باش و وانە دەڵێتەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی کە خانەوادەکەم تێگەیەنرابوون کە پاش تەواوکردنی پەیمانگە دانامەزرێم.

**سەبارەت بە دامەزراندنت، لە سلێمانی دامەزرایت، کەچی تۆ دەتویست لە دیوانیە دابمەزرێیت، هۆکارەکەی چی بوو؟**

– هەمووی بە هۆی سۆز و خۆشەویستم بۆ خەڵکی دڵسۆز و هاوڕێ باشەکانم لەو شوێنە، وەک مامۆستا گەورەکان کە بنەمای ئەوە بوون من هەڵگری ناوکی کاری هونەری بم. دیوانیە شتی زۆری پێ بەخشیم. مامۆستاکانم هەمیشە هانیان دەدام بە بەردەوامی کارەکانیان نمایش بکەم. نەک تەنها لە بواری شێوەکاری، بەڵکو لە بواری شانۆش کارم دەکرد. بۆیە یەکەم جار لە سەر شانۆ لە دیوانیە کاری نواندنم کرد، ئەویش شانۆی پیسکە بوو. لە یادمە مامۆستا (سامی عەبدولحەمید) کە ئێستا نەقیبی هونەرمەندانە، ئەو کاتە خوێندکاری قۆناغی ئامادەیی بوو، ئەویش

کاری مۆنتاژی بۆ شانۆگەرییەکە کرد.

**ئایا تەنها کاری دیکۆرت کرد بۆ شانۆگەرییەکە یاخود نواندن بوو؟**

– تەنها نواندن بوو، هەروەها دیوانیە هەلی خوێندنەوەی بۆ ڕەخساندم کە تا ئێستا بەردەوامە لەگەڵمدا، هێشتا دەخوێنمەوە و وێنە دەکێشم. لە دیوانیە زۆر دەمخوێندەوە، ڕەنگە هەندێک لە برادەران پێیان سەیر بێت کە بڵێم کە نەهجی بەلاغەم دەخوێندەوە. وەک وەفایەک بۆ مامۆستاکانم و بۆ ئەو بەها جوانانەی ئەو کاتە، حەزم کرد بۆ ماوەیەک لە دیوانیە خزمەت بکەم.

باست لەوە کرد کە بایەخت بە شانۆ دەدا و گرنگیت بە هەندێک کاری دیکە دەدا، ئەویش دامەزراندنی مۆزەخانەیەکی پۆشاکی فۆلکلۆری کوردی، عێراقی، عەرەبی و جیهانی لە شاری سلێمانی؟

– بەڵێ مۆزەخانەی پۆشاکی فۆلکلۆری کوردی، عێراقی و عەرەبی و جیهانی لە سلێمانی.

**ئەمە ساڵی چەند بوو؟**

– لە سەرەتای شەستەکان تا ١٩٧٣، دوایی ڕۆشتم بۆ سعودیە.

سعودییە یەکەم وڵات بوو کە بنکەی ئامرازی ڕوونکردنەوەی بیستن و بینینی دامەزراند؟

– بەڵێ، ساڵانی ١٩٥٧–١٩٥٨، ئەو کاتە ئامرازەکانی ڕوونکردنەوە لە بەغدا نەبوو. زۆر لە وێنەکانی منداڵەکانم نارد بۆ ئەڵمانیا بۆ ئەوەی لە پێشبڕکێی نێودەوڵەتیی منداڵەکاندا بەشداری بکات، هەندێک لەو منداڵانە خەڵات و بڕوانامەیان بۆ هاتەوە کە هەندێکیان لە قۆناغی سەرەتایی، ئامادەیی و پەیمانگە بوون.

کۆمەڵێک نیگارکێش دەرکەوتن لەوانەی تۆ لە سەرەتایی یاخود لە پەیمانگە وانەت پێ وتوونەتەوە؟

– هەندێ کەس دەرکەوتن کە من وانەم پێ وتوون و ئێستا هەڵگری مەشخەڵن بۆ ڕووناککردنەوەی ڕێگەی نەوەی ئێستا، وەک عەلی جۆلا و ڕاگری ئێستای ئەکادیمیا، هونەرمەند حیکمەت هندی کە ئێستا مامۆستایە لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکان. هەندێکیان سەفەریان کرد بۆ دەرەوەی وڵات بۆ بەدەستهێنانی پسپۆڕی.

مامۆستا ئازاد، سەبارەت بە گرنگیدان بە منداڵ و ئاراستەکردنی، گەر منداڵێک بەهرەی هەبوو، ئایا گرنگە منداڵەکە فێر بکەین یان ئاراستەی بکەین؟

– ئاراستەکردنی منداڵ و دروستکردنی کەشێکی جوان و گونجاو پێویستە تاوەکو هەست بکات لەو کەشە نزیکی دەکەیتەوە. دەبێ مامۆستا لە باخچەی ساوایان هەموو شێوازێکی زانستی بەکار بهێنێت بۆ نزیککردنەوەی منداڵ لە کەشێکی جوان و خۆش پاشان لێی نزیک دەبێتەوە بۆ ئەوەی ئاراستەی بکات تاوەکو بە ئازادی و بە عەفەویەتەوە نیگار بکێشێ. یەک شت هەیە کە بۆ مامۆستایانی باخچەی ساوایان جەختی لێ دەکەمەوە، ئەویش ئەوەیە منداڵ بەهای دەستەکانی بزانێت، دەست زۆر گرنگە بۆ مرۆڤ، لەبەر ئەوەی تەکنیکێکی وردی تیایە کە لە ئەندامەکانی تری لەشدا نییە، بە دەستی نان دەخوات، پێی دەنووسێ و کاری پێدەکات. کە منداڵ گرنگیی دەستی زانی، پارێزگارییشی دەکات.

**کاک ئازاد باست لە گرنگیی دەست کرد، بەتایبەتی بۆ هونەرمەند، من لە سەرەتای هاتنم بۆ پێشانگەکە پرسیارم لەسەر بەکارهێنانی ئامراز لێ کردی، وتت فڵچەکە نییە، بەڵکو دەستی فڵچەکەیە یاخود شانەی داری ژنانە؟**

– بێگومان ئەوە تەکنیکی کاری هونەرییە، گرنگیی دەست لە زیندووکردنەوەی شتە باوەکاندا کارێکی بێزارکەرە، من ماوەی ٣٠–٤٠ ساڵە فڵچە ئەگرم بە دەستمەوە. هەوڵم دا لە کاروانی کاری هونەریمدا

ڕێگەیەکی تر بگرمە بەر. بینیم کە تەختە جۆرێک لە جووڵە دەبەخشێ کە ناتوانم بە فڵچە ئەو جووڵەیە بکەم، واتە ئازادی دەبەخشێ لە جووڵەدا، هەر وەک چۆن باسی ٢-٣ لە تابلۆکانمت کرد کە شانەیان تیایە، چونکە جووڵەی ئاسانە و کە دەیگرم بە دەستمەوە، وەک فڵچە لە سەر پەڕەکە دەیجووڵێنم. بۆیە ئەو شتانەم دەداتێ کە لە خەیاڵمدایە و ئێوەش بینیتان.

**لە پێشانگەکەی پێشووتدا ئەم ڕێگەیەت بەکار نەهێنا؟**

- تەختەم بەکار هێنا، بەڵام شانە نا، تەختەی دەسکی فڵچەکە تەجاوزی کرد و بوو بە شانەی تەختەی ژنان.

مامۆستا عەتا سەبری پرسیاری لەبارەی ڕەنگەوە کرد کە تۆ بەکاری دەهێنیت، وتی قوتابخانەی ڕەنگ یان ئازادیت؟

- شتێکی جوانە کە هونەرمەندی گەورەی کۆچکردوو عەتا سەبری وای پێ دەوتم، کە کارەکانم نمایش دەکرد بۆ مامۆستا عەتا، پێی دەوتم چیت هەیە ئازادیت، پێم خۆش بوو کە وای پێ دەوتم، پێدەچێ بەکارهێنانی ڕەنگەکانمی بە دڵ بووبێ. ئەوەش جێگەی مشتومڕ بوو لای مامۆستاکانم.

**تۆ لایەنگری لە ڕەنگێکی دیاریکراو ناکەیت، هەندێک جار هەموو ڕەنگەکان لە تابلۆیەکدا هەیە؟**

- وایە، تابلۆکانم هەموو ڕەنگەکانیان تیایە و بینەر دەتوانێت هەموو تۆنەکان ببینێت کە بریتین لە هێڵەکان لە هەموو ڕەنگێکدا.

تەنها لە تابلۆیەک یان دوو تابلۆدا مادەی پۆستەرت بەکار هێناوە نەک زەیت؟

- وایە، تەنانەت هەندێ لە هاوڕێیانم پێیان وتم کوا تابلۆکانت بە زەیت، بەکارهێنانی زەیت ڕام دەکێشێ بۆ ئەوەی لە شوێنێکی دیاریکراودا بوەستم و دەبێت کۆمباسەکە ڕاکێشم و جێگیری بکەم، بەڵام تەندروستیم لە بەکارهێنانی زەیت لە کارەکانمدا یارمەتیم نادات، بەڵام چاوەڕێی هەلێکی باشم. ڕەنگە لە هاویندا بتوانم ئەزموونێکی دیکەی بەکارهێنانی زەیت نیشان بدەم.

ئەمەش نزیکە لە زەیتەوە، پێم وابێت مرۆڤ دەتوانێت تێبینیی مەودای لەیەکچوونی بەرزایی شاخوداخەکان بکات، مادەکە ئەستووریی دەداتێ؟

- ئەستووریی کارەکان ئەوە نییە کە تابلۆکە بە زەیت پڕڕەنگ بکەم. من کارێک لەگەڵ تابلۆکە دەکەم، هەندێک جار لەگەڵ تابلۆکەدا ئینفیعال دەکەم، وەک ئەوەی بمەوێت بە ڕەنگ بونیادی بنێم، ئەمەش لە پێشانگەکەدا هەیە، بەڵام تەنها لە یەک شتدا سەرکەوتوو بووم، ئەویش ئەوەیە ڕەنگە بونیادی پۆستەری پاش ماوەیەک پارچەی لێ بکەوێتە خوارەوە، بۆیە بۆ ئەم مەبەستە وا بیرم لێ کردەوە گەر پارچەی لێ بکەوێتە خوارەوە، ئەوا تابلۆکە جوانتر و قەشەنگتر دەبێت، بەتایبەتی گەر بەر شتێکی ڕەق بکەوێت و دانانی لە شوێنێکی باشدا یان ئەستوورییەکەی لە چوارچێوە بگیرێت. سەبارەت بە ڕەنگ، من شانازی دەکەم بەوەی ڕەنگەکان جۆرێک لە شەفافیەت و بریقەیان تیادایە، من دەزانم چۆن ڕەنگ دادەنێم تاوەکو ڕەهەند بدەم بە تابلۆکە، بۆیە توانیم سەربکەوم لە دانانی لەمسەیەکی پۆستەری لە سەر تابلۆکانم کە تامی زەیت دەدات. ئەم تابلۆیە بۆ من نموونەی بەهایەکی هونەریی ئەستووریی تابلۆکەیە، لە ئەنجامی هەندێ لەو

ئازاد شەوقی

چالاکییانەی کە دەیانبینم، من جوانیی تەلارسازیی ئەو خانوانەی پێنجوێن دەبینم، جوانییەکەی جۆرێک لە بونیادنانی پێ دام، کە هەست دەکەم من فلچە یان تەختەم نییە، بەڵکو سەدەها خانوو، تەنانەت هەندێک جار پەنجەگەورە بەکار دەهێنم بۆ تەواوکردنی تابلۆکە، ئەمە نموونەیەکە لەو نموونانەی پێش ئێستا باسمان کرد.

**کاک ئازاد، سەبارەت بە پێشانگەکەی تیایدا خەڵات کرایت لە ساڵی ڕابوردوو (١٩٨٧)دا، زۆر کاری تیادا بوو کە پلانی بۆ داڕێژرابوو، زۆر کار هەبوو کە تەختیت بوو، بەڵام لەم پێشانگەیەدا تەنها تابلۆیەک یان دوانە، ئایا گرنگیی تەختیت بۆ تابلۆ چییە؟**

– من پێم وایە تەختیت شتێکی گرنگە بۆ هونەرمەند. لە ئەکادیمیا و پەیمانگەکانی هونەرە جوانەکاندا وانەیەکی تایبەت هەبوو بە تەختیت، سەبارەت بە بواری تەختیتی هونەری کە باس لە بابەتێکی زۆر گرنگ دەکات، ئەویش بابەتی هونەری تەلارسازیی کەلەپوور، ساڵی ڕابوردوو لە پێشانگەیەکدا لە بەغدا پیشان درا. ئەمساڵ دوو نموونەم هەڵبژارد بۆ کارکردن بە حبری چینی بۆ ناوچەی پێنجوێن، لەو شوێنانەی کە زۆرم خۆش دەوێت، بەتایبەتی (شناشیل) خانووە کۆنەکان کە بە وردی و سەلیقە بونیاد نراون، پاشان بە شێوەیەکی جوان پلیکانەی بۆ کراوە، دوایی هاتوومەتە سەر قەڵای کۆنی هەولێر، ئەوەی ئێستا نا، پێش سیانەکردنی، ئەم تابلۆیەی لێرەدایە، نموونەی تەختیتی ڕەنگاوڕەنگ دەبەخشێ و تەختیتی تەلارسازی بۆ قەڵای کۆنی هەولێر بە هۆی بەها کۆنەکەی و وردەکارییە کۆنەکانیەوە.

**تابلۆیەکی دیکە هەیە ناوت ناوە ڕاوەماسی، هەروەها ساڵی ڕابوردووش تابلۆیەکت هەبوو بۆ کەشتییەکەی نوح، ئەوەش بە هەمان شێوە پلانی تیا بوو؟**

– خاتوونی بەڕێز، من هەموو ساڵێک مۆڵەتم هەیە بۆ خەیاڵم، واتە دەرفەتێک دەدەم بە خەیاڵ بۆ ئەوەی شتێک پێشکەش بکەم لەدایکبووی خەیاڵ بێت، بواری خەیاڵ کە لە مرۆڤدا فراوانە، ساڵی ڕابوردوو تابلۆی کەشتییەکەی نوحم کێشا، ئەمساڵ بیرم لە ڕاو و بەهای ڕاو لە ژیانی مرۆڤدا کردەوە، ڕاوچی کاتێک تۆڕەکەی فڕێ دەداتە ئاوەکەوە بۆ ئەوەی نێچیرەکەی دەست بکەوێت، دەبینی جۆرێک لە ئازاری تیایە کە ئاژەڵ پێوەی دەناڵێنێت، گەورەکان بچووکەکان دەخۆن، هەموو جیهانی دەریا وایە، بۆیە تابلۆیەکی تراژیدیم نەمر کرد و ناوم نا موچرکەی ماسی.

**کاک ئازاد، تۆ هەمیشە هەوڵ دەدەیت کەرەستەی خاو بەکار بهێنیت، ڕەنگی دیاریکراوی لێ دەربهێنیت، بیستوومە کە جۆرێک لە گژوگیات بەکار هێناوە؟**

– بەڵێ کەم جار، گیایەکە کە پێی دەڵێن ڕۆیناس. لە ڕاستیدا گوندنشینان ئەم گیایە بەکار دەهێنن بۆ ڕەنگکردنی سوفی سەرین و جێگەکانیان، هەندێ لە کچانیش بە کاری دەهێنن بۆ ڕەنگکردنی قژیان کە ڕەنگێکی جوان دەبەخشێتە قژەکە، وەک وەنەوشە، شینێکی سوورباو، وەکو گیای خەنە وایە، من بە زۆری بەکارم نەهێناوە، بەڵکو لە هەندێ شوێندا بە دەگمەن بەکارم هێناوە. دەترسم کە نەتوانم لە بەکارهێنانی ئەو گیایە لە سەر کاغەز سەرکەوتوو بم، لەبەر ئەوەی بەکارهێنانی لە سەر سوف سەرکەوتنی بە دەست هێناوە، هەروەها لە ڕەنگکردنی قژدا زۆر قەشەنگە، بەڵام ئەزموونی ئەوەم نییە لە سەر کاغەز بەکارم هێنابێت، بۆیە من بە کەمی بەکاری دەهێنم تاوەکو بزانم ئەنجامەکەی لە سەر کاغەز چییە و بزانم تا چەند سەرکەوتوو بووم یاخود شکستم هێناوە لە بەکارهێنانیدا، لەگەڵ تێکەڵکردنی تۆزێ خوێ لەگەڵیدا.

چۆن بەکار دەهێنرێت؟
لەگەڵ خوێ، کۆی دەکەمەوە لەگەڵ ڕەنگەکانی دیکە کە هەمە، بۆیە لەوانەیە ڕەنگێکی جیاوازتر ببەخشێت.

**ئەمەش بە هۆی تەمی کازیوەوە؟**

- بەڵێ، بابەتی کازیوەم هەبوو لە گوندی هێرۆ، کە گوندێکی گەشتیاریی جوان و قەشەنگە و نزیکە لە شاری قەڵادزێوە، بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەسام تاوەکو نیگار بکێشم... ئەو مامۆستایانەی ئەو کات لەگەڵمدا بوون، سات و ڕەنگی جوانم بینی، ڕەنگی سیلڤەر، شین، فەیروزی، فەیروزی هەتاو کە تیشکەکەی بە سەر گردەکەی نزیک گوندەکەدا بڵاو دەکاتەوە. ئیتر ئەم تابلۆیە لەدایک بوو، کازیوەم بینی، بە بۆچوونی بینەرانی تابلۆکە جیاواز دەرچوو بە ڕەنگەکانیەوە.

**تۆناتی ڕەنگی فەیروزی تیادایە. لەگەڵ بەکارهێنانێکی کەمی ڕەنگی سوور کە تۆ لە تابلۆکانتدا بوێرانە بە کاری دەهێنیت؟**

- ڕاستە، سەبارەت بە من هەندێ شت دەمترسێنێت، بەڵام تەنها شت کە دەمترسێنێت، ڕەنگە، چونکە یاریکردن بە ڕەنگ وەک گەمەی میوزیسیان وایە لەگەڵ گیتارەکەیدا، یاخود چۆن عاشق لەگەڵ مەعشوقەکەیدا گەمە دەکات. ڕەنگ لای من ئەو بەهایانەیە کە خۆشەویستیم پێ دەبەخشێ، ئارامیم پێ دەبەخشێ و هەندێک جاریش تووڕەم دەکات، هەندێک جاری تر شەڕی لەگەڵ دەکەم، بەڵام شەڕی خۆشەویستی تا دەگەمە قۆناغی ڕەزامەندبوون، واتە ئەو کاتەی ڕەنگ ڕەزامەندی دەبەخشێ، گفتوگۆی لەگەڵ دەکەم و گفتوگۆم لەگەڵ دەکات، ئایا لە شوێنی خۆیدایە لەو زاویەیەی کە من بەدوایدا دەچم، ئایا ڕەنگەکان هێمنن، جوان و چالاکن، هەندێک جار دەڵێم بەڵێ و هەندێک جار دەڵێم نەخێر، لێرەدا دووبارە و سێبارە دەگەڕێمەوە بۆی تا وا بکەم وێنەکە جوان و قەشەنگ بێت.

**من سەیری تەماشاکارانی پێشانگەکەتم کرد، زۆربەیان ئەو پرسیارە دەکەن، ئایا ئەم ڕەنگانە لە سروشتدا هەن؟ منیش هەمان پرسیارت ئاڕاستە دەکەم؟**

- بێگومان نەخێر، من سروشت ناو دەنێم دایک، قوتابخانە، ژیان. دایک نەوەیەک پەروەردە دەکات و مەزنیی خۆشی هەیە وەکو ژنێک، سروشت ناو دەنێم ژیان کە وا دەکات مرۆڤ فێر ببێت چۆن لە ژیاندا ڕەفتار بکات. گەر ژیان نەبوایە، سروشتیش نەدەبوو، مرۆڤ لە سەر زەوی نەبێت، لەدایک نابێت، بۆیە سروشت هات تا من وێنەی بکێشم، لێی وەرگرم و بیدەمێ. ژیان دانوستاندنە.
سەبارەت بە پرسیارکردنت دەربارەی ڕەنگەکان، ڕەنگەکان هەن، بەڵام هونەرمەند لە سروشتیان وەردەگرێت و دەیانداتەوە بە سروشت.

**وێنەگرتنی: (جەبار غەریب- وەلید کازم)**
**دەرهێنانی: (ئیبراهیم فەرحان ئیبراهیم)**
**ساڵ: ١٩٨٧ تەلەفزیۆنی بەغدا**

ئازاد شەوقی

# سەرنجە تایبەتییەکان

## سیزان لە عێراق

خولە ئیبراهیم لە ژمارە (٦٣٨٦)ی ڕۆژنامەی (الجمهورية)ی ڕۆژی ٦ی ئازاری ١٩٨٧ سەبارەت بەو پێشانگەی ڕێزلێنانەی لە هۆڵی (ڕەشید)ی شاری بەغدا لە لایەن بەڕێوەبەرایەتیی هونەری شێوەکارییەوە بۆ هونەرمەند ئازاد شەوقی ساز کراوە و پێشانگەکە ١٠ ڕۆژ بەردەوام بوو، دەڵێت (ئەم کارانە کۆمەڵێکی زۆرن لە تابلۆ ئینتباعییە جوانەکان کە بە شێوەیەک لە شێوەکان سیزانت بیر دەخاتەوە کە هەموو دنیای بە تابلۆکانییەوە سەرقاڵ کرد. ئەو توانایە یاخود ئەو بەراوردە لە کوێوە دێت؟ ئەو هێزە لە سروشتەوە سەرچاوەی گرتووە). خولە ئیبراهیم لە بەشێکی تری نووسینەکەیدا دەڵێت (بەڵام هەموو هونەرمەندێک دیدی تایبەتی هەیە و هێزێکی تایبەتی هەیە بۆ تێگەیشتن لە واتا و بیرۆکەکان و کارپێکردنیان پێکەوە، هەروەها سەیر نییە یاخود زیادەڕۆیی نییە کە بە پێشانگەکە بوترێت سیزان لە عێراقە).

## قەرزارباری سروشتم

لە ژمارە (٨٨٥)ی ڕۆژنامەی (هاوکاری) کە لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٢ دیدارێک لەگەڵ مامۆستا (ئازاد شەوقی) ساز کراوە و دیدارەکە لە لایەن (زکریات محەمەد حەسەن)ەوە ئەنجام دراوە، ئازاد شەوقی لە دیدارەکەدا دەڵێت (من قەرزارباری هەتاوم، هەتاو ژیان و گەرمی و ئەو ڕەنگە جوان و شیرینانەی پێ بەخشیوم کە لە ناو تابلۆکانمدا دەیانبینیت، من لە وێنەکێشە واقیعییەکانم، لە هەموو دەرگا هونەرییەکان دەدەم و حەزیش لە ئینتباعی دەکەم، بەڵام وەکو قوتابخانەیەکی هونەری سەر بەو نیم، من خولیای سروشت بووم بە هەموو واتا قووڵەکانیەوە، حەز لە هەموو ڕەنگەکان دەکەم و وا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەم وەک چۆن دڵدار مامەڵە لەگەڵ یارەکەیدا بکات).

لە دەفتەری پێشانگەی ساڵی ١٩٨٧دا مامۆستا (مستەفا ساڵح کەریم) نووسیوێتی (مەگەر بە شیعرەکانی گۆراندا هەندێ شوێنەواری کوردستانمان بناسینەوە، وا ئەم جارەش دەڵێم: تابلۆکانی کاک ئازاد ئەو سەرچاوە گەشانەن کە گوند و دێهاتەکانی کوردستانی پێ دەبینین، هێرۆ، کانی وەتمان، تەوێڵە، بیارە، پێنجوێن، عەسکەر، ئاغجەلەر... ئەم شوێنانە هەرگیز لە یاد ناچن و لەم تابلۆیانەشدا بە نەمری دەمێننەوە).

(سەعد هادی) لە ژمارە (٢٤٤٦)ی ڕۆژی ٢٢ی شوباتی ١٩٨٨ی ڕۆژنامەی (القادسیة)دا بابەتێکی نووسیوە بە ناوی (ئازاد شەوقی... خوێندکاری ڕووناکی) و تێیدا دەڵێت: "دەکرێت تایبەتمەندییەکانی ئازاد شەوقی لە چەند خاڵێکدا کۆ بکەینەوە، لەوانە جەختکردنەوە لە پێکهاتەی بیناسازی لە ناو تابلۆکانیدا و وەرگرتنی ئەو هێڵ و پانتاییە ستوونییانە کە هۆکارێکن بۆ دەربڕین، جەختکردنەوە لە ڕەنگە گەرمەکان و ڕیزبەندکردنیان بەپێی ڕەنگەکان، ئەم تایبەتمەندییانەی کە پێکەوە کۆ بوونەتەوە، ئەوە نیشان دەدەن کە بەرهەمی هونەرمەندێکی خاوەن ئەزموونە کە بەردەوام مامەڵەی لەگەڵ نێوەندە هونەرییەکاندا هەیە، هەروەها کارەکانی کاری شوێنن و مرۆڤ تیایدا بە شێوەیەکی هەمیشەیی ونە".

مامۆستا (جەمیل ڕۆژبەیانی) لە دەفتەری پێشانگەکەیدا کە لە ساڵی ١٩٨٧ کردوویەتیەوە، نووسیوێتی (چوومە پێشانگەی نیگارەکانی هونەرمەند ئازاد شەوقی، کە کوڕی مەحمود شەوقیی کۆنە هەڤاڵ و کۆنە هاوبیرمە و خاوەنی مێشکێکی هونەرمەندانە بوو، دەبێ کوڕ نیشانەی باوکی پێوە بێ، لە لاوییەوە هیوام بە ئازاد هەبووە. من کە هونەرمەند نیم، دەزانم چ سۆزێکی دەروونی و چ بیرێکی نیشتمانی ئەم خەیاڵانەی هێناوەتە بەرهەم و کردوونی بە گیانێکی زیندوو، چەندین وێرانەی هێناوەتە یاد و چەندین کڵاوی بابردووی خستووەتە سەر ڕووی کوردستان، ئافەرین ئازاد، بەرەو پێشتر بڕۆن بۆ خزمەتی هونەری نیشتمانی).

لە جێی مامت

م. جەمیل ڕۆژبەیانی

١٩٨٧/٣/٢٣

## ئەحمەد دڵزار

گۆڤاری ڕامان ژمارە (١٠٣) لاپەڕە (٢٠٦- ٢٠٧)ی ساڵی ٢٠٠٥

ئازاد شەوقی هونەرمەندێکی گەورەی دەستڕەنگین بوو، لە هونەرمەندە پێشەنگەکان بوو و بە هەموو مانای وشە ئینسان بوو، هەڵگری هەست

و خەیاڵێکی داهێنەرانەی چەسپاو بوو، سروشتی کوردستانە جوانە بەهەشتئاساکەمان لە تابلۆکانیدا زۆر ڕەنگیان داوەتەوە، کە سەیریان دەکەم هەستێکی وەک سروەی بەیانیانی کوردستان پاک و فێنک و شادیبەخش هەموو هەست و نەستم دادەگرێ.

## سلێمان شاکیر

ساڵی ١٩٩٦ لە گەلەری ئەربیلا نمایشێکی سلاید بۆ کارەکانی مامۆستا (ئازاد شەوقی) کرا و تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە شێوەکاران و خوێندکارانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی هەولێر ئامادەی ببوون، لەم نمایشەدا مامۆستا (سلێمان شاکیر) بەم شێوەیە سەبارەت بە (ئازاد شەوقی) دوا.
من و مامۆستا ئازاد بۆ ماوەی ٤٣ ساڵێک هاوڕێ بووین، مامۆستا ئازاد هێندەی بەرزیی قەڵات هونەرمەندێکی بەرزە، کاتێک لە ساڵی ١٩٥٣ پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغدا بەشی بەیانیان کرایەوە، ئێمە چەند هونەرخوازێک بووین لە هەولێر و سلێمانی و دهۆک و کەرکوک وەکو کۆمەڵێک لاوی کورد چووین بۆ بەشداریکردن و لەو پەیمانگەیە وەرگیراین، لە هەولێر من و برایەکی عەزیزی ترمان بە ناوی (ئیدوەر ولیم) کە ئێستا لە بەغدا دەژی و برادەران بنەماڵەی ئەو هونەرمەندە دەناسن، لە سلێمانی کاکە ئازاد و خوالێخۆشبوو کاکە خالید سەعید و کۆمەڵێک تر لەوێ وەرگیران.
من حەز دەکەم باس لەو ئیحساسە هونەرییە بکەم لە لای کاک ئازاد کە تازە لەوێ دروست بوو، هەرچەندە هونەری کوردی پچڕانێکی بەخۆوە بینیبوو لە دوای هونەرمەندی ناودار (دانیال قەساب) کە لە ساڵانی سی و چلەکان لە هەولێر ڕۆڵێکی زۆر باڵای هەبوو، بەڵام بە نەمانی دانیال قەساب بزووتنەوەی هونەری کزییەکی بەخۆوە بینی، ئەو کزییە مایەوە، هەرچەندە تەلەبەکانی ئەو لێرە مانەوە کە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو بۆ پێگەیاندنی هونەرمەند کە ئەمڕۆ لە هەولێر دەیانبینین، بەڵام ماوەیەک کزیی جووڵەی هونەری هەبوو، بەڵام لە دوای دەرچوونی ئەو خوێندکارانە لە پەیمانگە، ئەوانە بوونە کۆڵەکەی بزووتنەوەی هونەری.
کاتێک باس لە هونەر دەکەم، مەبەستم هونەر شێوەکاری و بەتایبەت نیگارکێشانە، کاک ئازاد نموونەی دڵسۆزی بوو لە ناو قوتابیانی داخلی، دەمانبینی ڕەنگ و فڵچەوەشاندنی ئەو لە هەمووان جیاوازتر بوو، ئەو ڕەنگە پاکوبێگەردانەی کە بەکاری دەهێنان، هەندێک جار لەوانە بوو کە دوور بێت لە لایەنە ئەکادیمییەکە، لەوانە بوو کە هەندێکمان بڵێین ئەوە لە ڕێبازە ئەکادیمییەکە چووەتە دەرەوە، بەڵام هێندە چێژی لێ وەردەگیرا، ئەوەندە

بەرهەمێکی پڕ جوانی و خۆشی بوو، تەنانەت مامۆستاکانیش پشتگیرییان دەکرد و هانیان دەدا کە ئەو ڕێبازەی خۆی تەرک نەکات، کاک ئازاد برادەری مامۆستاکانیشمان بوو، مامۆستاکانی ئێمە لەو کاتەدا چوار مامۆستا بوون کە کەڵە هونەرمەندەکانی عێراق بوون، خوا تەمەنی درێژ بکات تەنها (ئیسماعیل شێخلی) ماوە، بەڵام (فایەق حەسەن، عەتا سەبری، جەواد سەلیم) ئەوانە وەفاتیان کردووە.

ئێمە لە پشووەکاندا دەگەڕاینەوە. لە نێوان کاک ئازاد و مامۆستاکاندا پەیوەندی هەبوو و بە درێژایی ئەو سێ مانگەی تاکو دەگەڕاینەوە، نامەیان بۆ یەکدی دەنارد. کاک ئازاد ساڵی ١٩٥٥ پەیمانگەی تەواو کرد، بەڵام لە دوورەوە نەوەستا، بەڵکو دڵسۆزانە هەوڵی دەدا کە چۆن هونەرمەند پێبگەیەنێت، بەڵکو ژمارەیەک لە ڕۆڵەکانی ئەمڕۆ بەرهەمی کاک ئازادن، ئەو ڕێگەی هونەری پیشان داون و لە ئەنجامدا هونەرمەندی بەرز و جوانیان لێ پەیدا بوو، گەر لە ئێستادا بڕوانینە تابلۆکانی کاک ئازاد، ئەوا ئەو ڕەنگانەی کە من باسم کردن کە جێگەی شانازی و دڵخۆشی بوون لە زەمانی تەلەبایەتیدا، ئێستا لە هەمان کاتدا تابلۆکانی جێگەی دڵخۆشی و جێگەی هەستڕاکێشان و بزواندنی هەموو بینەرێکە، لە هەر شوێنێک پێشانگەی کردبێتەوە، لە بەغدا یان هەولێر لە سلێمانی بووبێت، ئەو ئینتباعەی بە بینەران نیشان داوە کە ئێوەش دەتوانن لە ڕێگەی ئەو سلایدانەوە کە بەشێکن لە سلایدەکانی کاک ئازاد کە ژمارەیان ١٠٠ سلایدە دەیبینن، ئەو کاتە دەڵێن خۆزگە ٣٠٠ سلاید بوایە، چونکە تابلۆکانی ئەوەندە جوان و بەپێزە، هەندێک لە ڕەخنەگران دەڵێن کاک ئازاد شێوازی ئینتباعیی وەرگرتووە یان هەندێک جار تەعبیرییە، یاخود هەندێک جار تێکەڵە، بەڵام بە ڕای من تا ئێستا ڕێبازی هونەری کوردی دروست نەبووە. بە ڕای من، کاک ئازاد لە ڕێبازی خۆی لای نەداوە، ئەوە سەرەتای ڕێبازێکە گەر هونەرمەندانی دوارۆژ ئەو ڕێبازە پەیڕەو بکەن، من لەو بڕوایەدام وردەوردە ڕێبازێکی تایبەت بە میللەتی کورد دروست دەبێت، چونکە سروشتی میللەتی کورد تایبەتمەندێتیی خۆی هەیە لە ڕەنگ و لە ژینگە. ئەو ڕەنگی ژینگە و عادات و تەقالید و ئەو جلوبەرگ و کولتوورەی میللەتی کورد، خۆشەویستی ئەو ڕەنگانە هەموو لە تابلۆکانی کاک ئازاددا دەبینم و ڕەنگ دەداتەوە، بۆیە دەڵێم بە ڕای من شێوازی کاک ئازاد شێوازی ئازادییە. نەک شێوازی تەعبیرییە، بەڵکو زۆر سەرکەوتوانە تابلۆکانی توخمی هونەری تێدا بەدیی دەکرێت، ئەو توخمانە کە پێویستە لە تابلۆدا لەنگ نەبێت، دەبێت هاوسەنگیی تێدا بێت، دەبێت پەیوەندییەکی تێدا بێت، هەروەها پەیوەندیی ڕەنگەکانی لەگەڵ یەکتری پتەو بێت، ئەوانە و زۆری تر لە ناو تابلۆکانی کاک ئازاددا بەدی دەکرێن.

# شێوەکارە کوردە پیرەکە

## نووسینی: ئاغالە

سەرسامم بە کارەکانت، یاری بە هەستی گواستنەوەم دەکەن و بۆ گوزارشتی وان کە واقعێکی کتومت کۆپییەکەیەتی. مامۆستا خۆی لە ئەزموونکارییەکانی (سیزان) داوە و توانیوێتی وانە و مەنهەجە ئەزموونگەرییەکەی ئەو هەزم بکات و شتی جیاواز و خاوەن مۆرک و گونجاو بخولْقینێ. من وا هەست دەکەم سەرسامییەکەی مامۆستا بۆ سروشت دەگەڕێتەوە بۆ بیری ئایینی کە خواوەند سروشتی وا جوان دامەزراندووە. بەو نووسینانەی سەرەوەم مەبەستمە بلێم پیرۆزباییت لێ دەکەم.

ئەو ڕەشنووسەی سەرەوە لە ساڵی 1993دا لە دەفتەری یاداشتی پێشانگەی گەلەری مۆزەخانە لەو ساڵەدا بۆم نووسیوە.

مامۆستا ئازاد کەسایەتییەکی بەهێز و دیار و چالاکی پەنجا ساڵەی گۆڕەپانی کوردستانی باشوور و عێراق و تەنانەت سعودیەش بووە. ساڵی 2014 لە گرووپی ڕابەری سەرکردەی دیموکراسی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بووم. کوڕێکی سعودی کە خەڵکی ڕیاز بوو و خاوەنی گەلەرییەکی کەلوپەلی ئەتنۆگرافی بوو، وتی ئێمە قەرزداری (ئازاد شەوقی کوردی)ن کە لە سەرەتای هەشتاکاندا لە مۆزەی ئەتنۆگرافی یەکەم مۆزەخانەی بۆ سعودیە دروست کرد. بەڵام خۆ سعودییەکان لە هەقی ئەو منەتبارییەدا شتێکی وایان بۆ ئەو پیاوە نەکردووە. هەروەها خۆشمان شتێکی وامان نەکردووە شایەنی باس بێت.

کەواتە: کاکە ئازاد شێوەکار و دامەزرێنەری مۆزە و شانۆ و جلوبەرگ بووە. ئەو بوارانە وایان لێ کردووە خەرمانی تابلۆی کەم بێت کە زیاتر لە ناوەڕاستی هەشتاکان ڕاست بووەوە و کەوتە سەر دروستکردنی سەدان تابلۆ و هەر لەو مێژووەوە بۆ ماوەی سی ساڵ تا ساتی مردنی نەوەستا.

لەسەر کارەکان و ژیانی ناوبراو دوکۆمێنتی زۆرم لە بەردەستدا نییە تا بە شێوەیەکی زانستی بچمە ناو قووڵایی کەسایەتی و پێکهاتەی ڕەگەز لە کارەکانیدا، زۆر بەیەکەوە دانیشتووین، بەڵام ساڵی 1995 شەوێک لە ماڵی مامۆستا مامەوە و زۆر لە کارەکانی کە لەو ژوورەدا بوون، نیشان دام... زۆر شتی باس دەکرد کە زۆر کەم پەیوەندییان بەیەکەوە هەبوو، ئەو توانای زۆری قسەکردنی هەبوو و تا دووی شەو هەر خۆی قسەی کرد، منیش پێشانگەم هەبوو زۆر هیلاک و کەنەفت بووم. مامۆستا پڕ بوو لە زانیاری و ئەزموونێکی بەرفراوانی لە کار و ناسینی کەسایەتی و چێژی هونەری هەبوو. بەڵام باش بیرم نەماوە...

هەندێ هێڵکاریی باشی کردبوون، وەک سکێچی تابلۆی نەخشەداڕێژراو کە فیگەری زۆریان تێدا بوو بە وردەکارییەوە... بەڵام زۆر کەم فیگەری ئەو مۆتیڤانە گەیشتنە سەر تابلۆکانی... تەمەن هۆکار بوو یان خۆی فیگەر و سروشتی بەیەک نەبەستەوە، دواتریش توانانەشکانی بەسەر کێشانی فیگەری مرۆڤ یا گیانلەبەر بۆ سەر ڕووبەری سەر قوماشی تابلۆکانی... ئەو کاتەی لە ساڵی 1987 پێشانگەکەی لە بەغدا کردەوە، تەقینەوەیەکی بەهێز بوو بۆ ناساندنی خودی خۆی و دەستڕەنگینیی شێوەکارانی کورد. لەو پێشانگەیەدا نووسەر و ڕۆژنامەکان زۆریان لەسەری هۆنییەوە، هەروەها کوردەکانیش... ڕەخنەم نەبینی لەسەری بنوسرێ کە دەبوو مافی خۆی پێ بدرێ. چ تانە و چ ڕەخنە، هەر هەموویان لەسەر یەک تەوەر سووڕاونەتەوە (ئازاد شەوقی سیزان یان سیزان العراق یان عودة سیزان).

بەڵام من ئەو کاتە لای هاوڕێکانم ڕەخنەم دەگرت و دەمگوت مامۆستا ئازاد بۆ سروشتەکانی وا ڕووت و بێمرۆڤن و جووڵە لە ناو تابلۆکانیدا نییە؟ لەو ساتەی ئەو کاری لەسەر دەکرد، زۆر بە خەستی چاودێریی دەستوپەنجەی هونەرمەندان دەکرا کە چی دادەڕێژن. بۆیە ئەو نووسەرانە بەگشتی پێیان خۆش بوو کاک ئازاد کوردستان وا نیشان بدات و هونەرەکەی لە هونەری بەرهەڵستی دوور بکەوێتەوە. بە کرداریش، کوردستان سروشتی بە دەشت و گوندیەوە چۆڵوهۆڵ بوو، کورد ئەنفال کراوە و ئەوەی

لە ناو شارە، هەمووی سەربازە. ئەو پێشانگە و پرۆژانە لەو ساتەدا بە کاری پەسەند دەناسران. بەڵام ئازاد شەوقی شێوازی دەربڕین و تەکنیکی هاوتا نەبوون لەگەڵ بیر و ئەندێشە کوردایەتی و نیشتمانییەکەی، هەرگیز نکۆڵی لە شۆڕشگێڕبوونی مامۆستا ناکرێ. ئەو خۆی بە پێشمەرگە دەزانی، خۆی بۆی گێرامەوە ساڵی 1998 ڕۆژێک چووە بۆ مەڵبەندی یەکێتی لە سلێمانی و پێی وتبوون چەکم بدەنێ، دەچمە چەمچەماڵ و لەگەڵ برا پێشمەرگەکان لە دژی بەعس شەڕ دەکەم... کەچی پێکهاتەی زۆرینەی تابلۆکانی سروشتێکی ڕووتی بێمرۆڤن و لە کار و ئایدیۆلۆجیی ئیسلامی دەچن کە دروستکردنی فیگەر لە کارەکانیاندا دروست نییە و ڕێگەپێنەدراوە. مەبەستم نییە بەراورد و چواندن بکەم، بەڵام دەکرێ ئەو خوێندنەوەیەش بکرێ.

ساڵێک دوای پێشانگەکەی ئەو لە ساڵی 1988، کۆمەڵێک لە شێوەکارانی عەرەبی عێراق بە سەرپەرشتیی هونەرمەندی ناسراو فایەق حەسەن بە کۆمەڵ ڕاستەوخۆ نیگاری سروشتی کوردستانیان دەکێشا. ئەوەش دوای ئەنفالەکە بوو تا بیخەنە بەرچاوی چاپەمەنیی ناوەوە و دەرەوە و نیشانی بدەن شتێک ڕووی نەداوە، نە کەس ئەنفال کراوە و نە چەکی کیمایی بەکار هێنراوە!!! سروشت وەک خۆی هەر جوانە و کوردستان بەهەشتە. ئەو کاتە سەرباز بووم لە شاری مسیب کە پێشانگەیەک بە نێونیشانی (ربیع فی کوردستان) لە ناوەندی هونەریی سەدام کرایەوە و لە ڕۆژی کردنەوەیدا لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم ئامادە بووم. زۆر پەست و بێتاقەت بووم بەو کارە بەکۆمەڵە کە لەپێناو شاردنەوەی قڕکردنی کورد بەڕێوە چوو. تابلۆکان سروشتێکی ڕووتوقووت و بێگیان بوون.

تەکنیک و شێواز:

توانای کارکردنی مامۆستا زۆر باش بوو. لە تەمەنی شەستەکاندا کەوتە گوڕ و بە زنجیرەکارێکی لەسەر سروشت بە باشی خۆی سەپاند. سروشت هاوینە یا پاییزە و زۆر لەو کارانە بە ڕەنگی چەور یا گواش و ڕەنگی پۆستەر کراون.. نەک ڕەنگی ئەکرەلیک، وەک هەندێ نووسەر زانیاریی وایان لەسەر کەرەستەی بەکاربردووی نووسیوە. چونکە ئەکرەلیک لە ساڵی دوو هەزارەوە هاتە کوردستان و عێراق.

گۆشەبینینی چاوی شێوەکار لە زۆربەی تابلۆکانیدا لە ئاستی ناوەڕاستدایە و گۆشەی ڕوانینی ژێر بینینی چاو یا سەرووی چاوی نییە. ڕێگەیەکی کورت و دابڕاو و کۆمەڵێ دارسپیندار بەرز دەوری لادێیەکیان داوە، درەختی چڕ وای کردووە بە تەواوی خانووەکان نەبینێت، لە پاشان چیا دێت وەک دووریی دووەم. دووریی سێیەم

هەورە یا ئاسمانێکی تەخت کە بە هارمۆنیی ڕەنگێک کۆتایی دێت.
فیگەر لەم کارانەیدا زۆر دەگمەنە، وای بۆ دەچم لەبەر قورسیی کێشانی و یەکسانبوون و نەبوونی لەگەڵ دوورییەکانی تابلۆکە فیگەری نەهێشتبێ. چونکە ئەو چەندان کارەی فیگەریان تێدایە، فیگەرەکان شێواو و ناڕێکن لەگەڵ داڕشتنی واقیعی، یا نیگارکێشانی ئیمپریشنیزم نایەتەوە یەک. زۆر لەو فیگەرانەی کە کێشاونی، زیاتر کاریگەرە بە فیگەرەکانی نیگارکێشانی عەرەب، وەک کازم حەیدەر و زیا عەزاوی.
جێگیرکردنی پەڵە ڕەنگەکان بە تەنیشت یەک و لەسەر یەک، جیهانێکی هارمۆنیی زۆر تازە و گەڕانەوە بوو بۆ پەنجا ساڵ بەر لە کارەکانی کە شێوەکارە عێراقییەکان کاریان پێ کردبوو، وەک فایەق حەسەن و عەتا سەبری، چونکە سەرەتای هەشتاکان هونەری شێوەکاریی عێراق نوقمی شێوازی ئەبستراکت بووبوو، دونیای کێشەئامێز عێراق و سەرکێشیی دەسەڵاتی عێراق کاریگەرییان لەسەر نەهێشتنی فیگەر هەبوو.
گەڕانەوەی ئازاد شەوقی بۆ سروشت و شێوازی پەڵەی سیزانی بۆ چێژکارانی عێراقی و سەرتاپا وێرانی و شەڕ بوونە هۆی شکاندنی تینوێتیی جەماوەر و ئارامی. هەربۆیە دەستخۆشی زۆر و بێسنوور بەسەر شێوەکارە کوردە پیرەکەدا باری.

ئازاد شەوقی